

یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا
38

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگنامەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی چوارەم تەمموزی - ٢٠١١

## ئازیزترین خۆشەویست!

هاوڕێی چاك بە

باشترین کاتی خەوتن!

سەرچاوەی مرۆیی سەرمایەیەکی فەرامۆشکراو!

ئەدیسۆن، داهێنەرێکی دەگمەن

گەشبینی و گشتبینی

گەندەڵی کارگێڕی

The first Magazine Specialized in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی


سالی چوارەم - ژمارە 38 - تەممووزی 2011

**خاوەنی ئیمتیاز**

ئەندازیار: مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

**سەرنووسەر**

عادل محەممەد شێخانی

sarnosar@bryarmagazine.com

**بەڕێوەبەری نووسین**

بەرزان ئەبوبەکر

**دەستەی نووسەران**

هاژە شێروانی — پەری شێخ کەریم

بێگەرد فارس — محەممەد مێرگەیی

وەهاب حەسیب — ئەسکەندەر ڕەحیم

محمد هاشم محمد

**بەشی هونەری و دیزاین**

قەیدار ڕەحیم

**ڕاوێژکاری یاسایی**

پارێزەر: ئازاد محێدین

**بەشی ڕیکلام**

07480112787

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

نرخ 2500 دینار






























**ناونیشانی گۆڤار**

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری جەمالی حاجی عەلی- نهۆمی سێیەم

نزیك پردی خەسرەو خاڵ

٣١٩٣٩٤٦ - ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

E-mail: bryar@bryarmagazine.com


دابەشکردن: کۆمپانیای پەیام

# هەموو مرۆڤەکان دەبێت بمرن،

# بەڵام هەموو مرۆڤەکان

# زیندوو نین!

rasan group

ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری
گرووپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە




# سەرچاوەی مرۆیی

# سەرمایەیەکی فەرامۆشکراو!

لە بەرگی پشتەوەی کتێبی نووسەرێکی وڵاتێکی ئەفریقیدا نووسرابوو، لەو پۆستانەی کە لە حکومەتی وڵاتەکەیدا ڕۆڵی تێدا بینیووە، (وەزیری سەرچاوە مرۆییەکان بە پلەی جێگری سەرۆك وەزیران).

هەر لە نێوی پۆستەکەڕا بۆت دەردەکەوێت کە ئەم وڵاتە گرنگی بە سەرچاوەی مرۆیی دەداتو دیاریکردنی وەزیرو وەزارەتێك بۆ ئەم مەبەستە، بێگومان جێگای خۆشحاڵییە، ئەمن بێئەوەی لە مەهامی ئەو وەزارەتە ئاگاداربمو بزانم چییان کردووەو چییان ئەنجامداوە، ئەم کارە بە هەنگاوێکی باش دەزانمو ئاوڕدانەوە بۆ لای سەرچاوەی مرۆییو تەماشاکردنی سامانی مرۆیی، وەکو گەنجینەیەکی بەهادارو بێ وێنە، نیشانەی زیادبوونی هۆشیاری تاکو دەوڵەتە.

هاوکات بە هەناسەیەکی ساردەوە گوتم: خۆزگە ئێمەش وەزیرێکی وەهامان دەبوو، خۆزگە لە بری وەزارەتی سامانە سروشتییەکان، کە من جگە لەوەی بەیناوبەین لە ڕاگەیاندنەکاندا ڕەخنەو گازندەی زۆری ئاڕاستە دەکرێتو زوو زوو داوای لێپرسینەوەی لێدەکرێت، لە لایەن پەرلەمانەوە، هیچی تری لەبارەوە نازانم!

لە کاتێکدا زۆربەی تاکەکانی کۆمەڵگا چاویان بڕیوەتە ئەم وەزارەتەو چاوەڕوانی هەموو خێروخۆشیو پێشکەوتنێك لەو دەکەن!

ئەمەش تا ڕادەیەکی زۆر گوزارش لە قسوری ماریفیو نەشارەزاییمان لە ڕەهەندەکانی پێشکەوتنو پەرەپێدان دەکاتو وەکو کۆمەڵگا سەرەتاییەکان تەنها بە زمانی بازاڕو پارەو سەروەتو سامانو کەڵەکەبوونی شتومەکو پێداویستییە ماددییەکان ڕەوتی کۆمەڵگا دیاری دەکەین!

بۆ پێشکەوتنی وڵاتو گەشەپێدانو بە شارستانی بوونی کۆمەڵگاو باڵابوونی ڕۆشنبیری چاوەڕوانی هەناردنی نەوتو زیادبوونی داهات دەکەینو نازانین کە ئەم کارە بەرهەمی وەزارەتەکانی خوێندنی باڵاو کارو وەزارەتە پەیوەندیدارەکانی سامانی مرۆیین!

هەڵبەتە نکولی لە گرنگی سەروەتو سامانە سروشتیو داهاتە نیشتمانییەکان ناکرێت، بەڵام کاتێك ئێمە لێیان سوودمەند دەبین کە بەپێی بەرنامەیەکی زانستی بۆ بیناکردنی ژیارو شارستانییەتو ژێرخانی ڕۆشنبیریو بەهێزکردنی بەها نەتەوەییو کلتورییەکان بەکاربهێنرێت.

نەك تەنها هەر چاوەڕوانی ئەوەبین هەر کەسەو بەشە پارەی خۆی لە باخەڵنێو بە کەیفو ئارەزووی خۆی، بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی تەواوی ڕابواردنو ڕەفاهییەت فەراهەم بکات.

لە بارودۆخێکی وەهادا مرۆڤەکان هەموو بەها بەرزەکانیان لە دەست دەدەنو ڕۆژ بە ڕۆژ کۆمەڵگا زێتر بەرەوداڕووخانو هەرەسهێنان هەنگاو دەنێتو فەوزاو ڕێزنەگرتنی یاساو ستەمو بە هەدەردانی سامانی گشتیو لاوازبوونی پایەکانی دەوڵەت، زێتر باڵ بەسەر نیشتماندا دەکێشێت.

پێم سەیرە کە ئێمە ڕۆژانە زۆرێك لە قسەو گفتوگۆو ڕاوبۆچوونەکانمان، سەبارەت بە هەوڵدانە بۆ پێشکەوتنو بەرەوپێشچوونو ڕزگارکردنی وڵاتە لە دواکەوتنو بێ بەرنامەییو بنەبڕکردنی فەسادی ئیداری.

بەڵام بەداخەوە خاڵی سەرەکی ژمارەی گەورەی هاوکێشەکە، کە مرۆڤە ونە لەم نێوەندەدا.

دەبوا ئێمە لە پێش وەزارەتە تەقلیدییەکانەوە وەزارەتی سەرچاوەی مرۆییو گەشەپێدانی مرۆییو وەزارەتی تایبەت بە گەنجانو ئافرەتانو منداڵانمان هەبووایە، بۆ ئاساییکردنەوەی بارودۆخی دەروونی تاکی کورد، وەزارەتی سڕینەوەی شوێنەواری جەنگو چەندین دەزگای بە مەدەنی کردنی کۆمەڵگامان دروست کردبا.

دانانی وەزارەتێك بە نێوی شەهیدانو ئەنفال، کە تەنها کاری دابەشکردنی مووچەیەکی بێ بەرنامەیە بەسەر کەسوکاری شەهیدانو ئەنفالکراوەکاندا، کە ئەو کارە بە دەزگایەکی ژمێریاریش دەکرێت، پڕۆژەیەکی سەرپێییەو بە هەدەربردنی سامانێکی زۆرە لە ژێر ناوی وەزارەتدا.

ئێستاش زۆربەی زۆری منداڵانی شەهیدانو نەوەی ئەنفالکراوەکان، لە نێو خۆڵو لەسەر جادەو کۆڵانەکان یاری دەکەنو لە پارکو یاریگاو شاری یاریو جێگای حەوانەوەو کتێبخانەو مەلەوانگەو خولی هاوینەو چالاکییە وەرزشیو ڕۆشنبیرییەکان مەحرومن!!

تا ئێستا جگە لە بڕە پارەیەك کە وەکو سەدەقە پێیان دەدرێت، ئەوان هەر لە کەناردانو لە کۆمەڵگا زۆرە ملێکاندا ژیان بەسەر دەبەن.

نازونیعمەتی وڵاتو تەرفیهی وەرزی هاوینیش، تەنها بۆ خواپێداوانو منداڵی دەوڵەمەندەکانە، قوتابخانە حکومییەکان تەنها منداڵانی هەژار تێیدا دەخوێننو دەوڵەمەندانو سەردارانی وڵات تا قوتابخانەی تایبەتی بیانی وەستابێت، بێزیان نایەت منداڵانیان بنێرنە قوتابخانە ئاساییەکان.

کارکردن بۆ سوود وەرگرتن لە گەورەترین سەروەت کە سەرچاوەی مرۆییە، هەنگاوی دڵسۆزانەی بەرنامە بۆدانراوی دەوێتو بە کۆنترۆڵکردنی ئەو سەرمایەیە نابێت بۆ بەرژەوەندی تایبەت.

ئەمڕۆش سەردەمی سەردەمی زانستو پێشکەوتنو فیکرو ئایدۆلۆجیایەو تەنها بە سەروەتو سامانی ماددی ناتوانین بچینە ڕیزی وڵاتانی پێشکەوتووەوە.

# کارگێڕی بە گوفتار

ئێوە پێویستان بە پێشەوایەکی دادەوەر هەیە،
نەك پێشەوایەکی قسەکار!
**عوسمانی کوڕی عەففان**

ویست، ڕێکخستن، کات،
ئەمانە سیانەی هونەری فێربوونن!
**مارسیل پریڤۆ**

ئەوەی بەرەو پێشەوە نەڕوات،
بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە!
**پەندێکی لاتینی**

بۆچی پەنا بۆ ژەهر دەبەیت،
لە کاتێکدا دەتوانیت بە هەنگوین بیکوژیت!
**پەندێکی فارسی**

متمانە بە خۆبوون،
یەکەمین نهێنی سەرکەوتنە!
**پەندێکی فەرەنسی**

خۆشەویستی نابینایە،
بەڵام هاوسەرگیری چاوەکانی بۆ دەگێڕێتەوە!
**پەندێکی ئەڵمانی**

## کارگێڕی بە چیرۆك



# هەمیشە ڕاستگۆبە!

تەنها چەند ڕۆژێکی مابوو بۆ تاقیکردنەوەکان، کاتێك چوار خوێندکاری یەکێك لە کۆلێژەکان بڕیاریاندا بە مەبەستی سەیرانو پشوودان سەردانی ناوچەیەکی گەشتیاری بکەن، بەو ئامانجەی کە دواتر بە زەینێکی ڕوونو توانایەکی نوێوە تاقیکردنەوەکانیان ئەنجام بدەن!

کاتێك گەیشتنە شوێنی مەبەست، شوێنەکەیان زۆر بە دڵ بوو، بە شێوەیەك کە دواکەوتنو نەیانتوانی بە تاقیکردنەوەی یەکەمدا بگەن، هاوکات بە دوای بەهانەیەکدا دەگەڕان، بۆئەوەی لای مامۆستاکەیان داوای پۆزش بکەنو ئەویش تاقیکردنەوەکەیان بۆ دووبارە بکاتەوە!

بە مامۆستاکەیان ڕاگەیاند کە ئەوان لە ڕێگای هاتنەوەیاندا، لە نیوەی شەودا یەکێك لە تایەی ئۆتۆمبێلەکەیان تەقیوەو لە ناوچەیەکیشدا کە هیچ دانیشتوانێکی لێ نەبووەو ناچاربوون بمێننەوە بۆ ڕۆژی دووەم، بۆئەوەی تایەکە چاك بکەن!

مامۆستا ڕازیبوو، تاقیکردنەوەکەی بۆ دواخستن، بەڵام لە ڕۆژی دیاریکراو بۆ ئەنجامدانی تاقیکردنەوەکە مامۆستا هەر یەکەیانی لە سووچێکی هۆڵەکە داناو بە شێوەیەك کەس نەتوانێت تەماشای وەڵامی هاوڕێکەی بکاتو بزانێت چی نووسیوە!

لە ناکاو هەر چواریان بەرەو ڕووی پرسیارەکان بوونەوە کە ئەمانە بوون:

پ١/ کام تایەی ئۆتۆمبێلەکە تەقی!

پ٢/ کاتی ڕوودانی ئەو ڕووداوە کاتژمێر چەند بوو؟

پ٣/ ئەو کاتە کێ ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی؟

**لەم چیرۆکەوە فێردەبین:**

١- زۆرگرنگە مرۆڤ لەسەر ڕاستگۆییو ڕاستبێژیی پەروەردە بێتو هەرگیز درۆ نەکات، چونکە وەکو پێشینان وتویانە: پەتی درۆ کورتە!

٢- لە ناڕەحەتترین ساتەکانی ژیاندا، لەو کاتەدا کەوا گومان دەبەین درۆکردن فریامان دەکەوێت، پێویستە ڕاستگۆبینو دەبێت هەمیشە وابزانین کە تەنها ڕاستگۆیی فریامان دەکەوێت.

٣- ڕاستگۆیی جوانترین سیمای مرۆڤی شکۆدارو بەرزو بڵندو بەهادارەو بەو سیفەتە جوانە، مرۆڤ لە چاوی مرۆڤدا هەمیشە گەورەتر دەبێت.

٤- ئەگەر هەر هەڵەیەکت کرد، هەر چەندە گەورەش بوو، بوێرانەو بە ڕاستگۆیی دان بە هەڵەکەدا بنێو بە دڵنیاییەوە ئەنجامەکەی پەسەند بکە، چونکە ئەو کارە دڵنیاو ئاسوودەت دەکاتو لە دڵەڕاوکێو ترسو نیگەرانیو چاوەڕوانی ڕووداوی کتوپڕ ڕزگارت دەکات!

٥- ئەگەر جارێك لە جاران بە درۆیەك خۆت قوتار کرد، وانەزانی ڕزگارت بووە، ئەوە بزانە کە بەسە بۆ سزای دەروونیت کە بەردەوام لە ترسی ئەوەدا دەژیت، کە لەوانەیە بەرامبەر ڕاستییەکەی بۆ دەرکەوێتو شەرمەزار بیت!

٦- تەماشا بکە، ئەو چوار خوێندکارە خۆیان تووشی چ هەڵوێستێکی پڕ شەرمەزاری کرد، چۆن متمانەی خۆیان دۆڕاند، ئێستا بەرامبەر بەو پرسیارانە چی دەکەن؟ خۆ ئەگەر وەڵام بدەنەوە دەبێت هەر یەکەو (٣) درۆی تر بکات، چونکە وەڵامەکانیان جیاوازو دوور لە ڕاستییە!

کەواتە با هەرگیز ڕێگا بە خۆمان نەدەینو تەنها بۆ جارێکیش درۆ نەکەین، چونکە دواتر ناچار دەبین، بۆ پینەکردنی درۆکانمان، درۆی تر بکەینو ئەو زنجیرە ئەهریمەنییەش کۆتایی پێنایەت!

**دەبا ڕاستگۆیی دروشمی ژیانمان بێت، هەرگیز جگە لە ڕاستی شتێکی تر بەسەر زارماندا نەیەت!**

# گەندەڵی کارگێڕی

ئا: خەندە ڕەمەزان
- زکرا ڕەمزی



بەشی یەکەم

**بەندی یەکەم:**
**کورتە باسێکی گەندەڵی:**

کاریگەری ڕۆڵی کارگێڕیو بەڕێوەبردن لەسەر هەندێ بوار لە کۆنەوە تا ئەمڕۆ بە ئایندەشەوە، یەکەیەکی سەلمێندراوی بە هێزە بۆئەوەی چارەنووسی تاكو کۆمەڵو بوارەکانی دەسەڵاتی ئابوری سیاسیو کەلتوریو سیستەمی دەوڵەتو ڕێکخراوەکان بەرەو شوێنێك ببات، یان سەرکەوتوویان بکات، یاخود دەیانگەڕێنێتەوە بۆ دواوە، کارگێڕی لە کاتی ئاشتی لە هەر بەرنامەو پلانو خشتەیەك ئامادەیی هەیە، سەرکەوتنەکان بۆ بەڕێوەبردن دەبێت، ئەگەر ئەو ئیدارەیە یەکسانی بەڕێوەبردنی لێوەشاوە پاڵپشت بە زانستو تەکنەلۆژیا بێت، بۆیە ئەگەر بە دوورودرێژی باس لە ئیدارەی دەوڵەتو ڕێکخراوەکان بکەین، ئەوا گرنگە بەڕێوەبردن لە هەندێ بواری تردا باس بکەین:

١- ڕۆڵی بەڕێوەبردن، لە بەگژاچوونەوەی گەندەڵی.

٢- ڕۆڵی بەڕێوەبردن، لە چاکسازی سیاسیو ئابوری.

بەڵام ئەوەی لێرەدا لای ئێمە گرنگ بێت، تیشکی بخەینە سەر لەچوارچێوەی باسەکەماندا بێتو بتوانین باسی بکەین، (ڕۆڵی بەڕێوەبردنە لە بەگژاچوونەوەی گەندەڵی). یەکێك لە زەقترین قەیران لەو قەیرانانەی لە هەرێمی کوردستانو لە سایەی دەسەڵاتی سیاسی خۆماڵییەوە سەری هەڵداوە دیاردەی گەندەڵییە، ئەو گەندەڵییەش بەشێوەیەك تەشەنەی کردووە کە بووەتە دیاردەیەکی بەرچاو، سەرباسی قسەی نێوان تاکەکانی کوردستان لەگەڵ یەکتری، بابەتی نێو ڕۆژنامەو گۆڤار، زۆربەی ئەوانەی لەسەر گەندەڵی قسەیان کردووە، یان شتیان نوسیووە، تەنانەت زۆر لە سیاسەتمەدارو ئەندامانی باڵای پارتە سەرەکییەکانی کوردستانیش، پێیانوایە بەشێکی زۆری نارەزایی خەڵك لە دەسەڵاتی سیاسیو حکومەتی هەرێمی کوردستان بە هەردوو ئیدارەکەیەوە، لە بوونو بەربڵاوبوونەوەی بێ سنووری گەندەڵی سەرچاوەی گرتووە.

ئەو نارەزاییو بێزاربوونەی خەڵکیش گەیشتە ڕادەیەکی ئەو تۆ کە هەریەکە لەدوو پارتی دەسەڵاتدار لە سەردەمی دوو حکومەتی وا لێبکات هەم دانی پێدابنێن، هەم هەوڵیش بدەن سنورێکی بۆ دابنێن، ئیدی ئەو هەوڵانەیان چەند سووربوونی تێدا بووە؟ یان چەندە بەرهەمی هەبووە؟ لەبەرئەوەش کە هەڵدانەوەی لاپەڕە سەختو دژوارەکانی کوردستانو کردنەوەی لاپەڕەی نوێ لە کوردستانو بنیادنانی کوردستانی نوێ، دوور لەو قەیرانو سەختییانە، لێرەشدا مەرامی سەرەکیمان ئەوە دەبێت ڕێگەچارەی گونجاو بۆ ئەو دیاردەیە دەستنیشان بکەین، تاکو لە سیستەمی بەڕێوەبردنی کوردیدا بە یەکجاری ڕیشەکێش بکرێت، یان لایەنی کەم سنووری بۆ دابنرێت.

**- چەند ڕاستییەك لە بارەی گەندەڵیو ڕاستی بەرامبەریان:**

بەرلەوەی بچینە سەر باسکردنی واتای گەندەڵیو شێوەو هۆو چارەسەرییەکانی چەند ڕاستییەك لە بارەیەوە هەیە، باشترە هەم ئەوان بخەینەڕوو، هەم ئەو ڕاستییانەش کە لە بەرامبەریاندا هەیە:

**١- گەندەڵی لە هەموو دونیادا هەیە:**

ڕاستە، گەندەڵی لە سەرتاپای وڵاتانی دونیادا هەیە، هەر لە ئەمریکاوە بگرە هەتا جیبۆتیو تەیمووری ڕۆژهەڵات، هەر لە سویدەوە هەتا باشووری ئەفریقیا، بەڵام لە بەرامبەر ئەو ڕاستییەدا چەند ڕاستییەکی تر هەن، دەبێت باسی ئەوانیش بکرێت:

- گەندەڵی دیاردەیەکی دزێوە، ئەگەر لە هەموو وڵاتانی دونیاش هەبێت، ئەو هەبوونە هەرگیز ڕووی ڕەشی سپی ناکاتەوەو خاسییەتی دزێویو نارەوایی لەسەر هەڵناگرێت.

- هەبوونی گەندەڵی لە وڵاتانی دونیا، نابێتە پاساو تاکو لە سایەی حوکمڕانی ئەودا گەندەڵی هەبێت.

- ڕادەو ئاستی گەندەڵی لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر دەگۆڕێت، کە دەگوترێ بۆ نموونە گەندەڵی لە دانیمارکو ئەمریکاش هەیە، دەبێت بزانرێت ئەو گەندەڵییەی لەوێدا هەیە، جیاوازییەکی یەکجار بەر فراوانی هەیە لەگەڵ ئەو گەندەڵییەی لە عێراقدا هەیە.

**٢- گەندەڵی بنبڕ ناکرێت: بەڵێ**

گەندەڵی بنبڕ ناکرێت، باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە ئەگەر بکرابایە، دەبوو وڵاتە پێشکەوتووەکان ئەوەیان بۆ بکرایە، بەڵام ئەوانیش نەیانتوانیوە بنبڕی بکەن، هەروەها لە توانا نەبوونی بنبڕکردنی گەندەڵیدا، مانای وانییە کە ناکرێت سنووری بۆ دابندرێت.

**بەندی دووەم: پێناسەکانی گەندەڵی:**

لەم دواییانەدا توێژینەوە لە لایەن شارەزایانی ئابووریو یاساو زانستە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان پەرەی سەندووەو هەر لایەك بیروڕای جیاوازو تایبەتی خۆیان هەیە دەربارەی گەندەڵیو پێناسەکانی گەندەڵی، بۆیە گەندەڵی پێناسەی زۆری بۆکراوە، لێرەشدا هەندێك لەو پێناسانە دەخەینە ڕوو، لەوانەش:

- پێناسەی گەندەڵی لە زانستی ئابووریدا: بریتییە لە بێهێزی دامەزراوە ئابوورییە گشتییەکان، کە دیارترین هۆکاری گەندەڵییە دەبێتە هۆی دابەزینی ئاستی وەبەرهێنانو سستیو لاوازی پرۆژەکانی بوژاندنەوە.
- پێناسەی گەندەڵی لە زانستی سیاسەتدا: شارەزایان بنەمای هاوبەش دادەنێن لە نێوان گەندەڵی وەکو ڕەفتارو هەڵوێست، کە نیشانەی لادانە، بەمجۆرە دەسەڵاتی ڕاستو پاك دوژمنی هەموو جۆرە گەندەڵییەکە، ئەم پێوەرەش بەسەر هەموو لایەنە سیاسییەکانو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنیدا پیادە دەبێت.
- پێناسەی گەندەڵی لە زانستی یاسادا: گەندەڵی بریتییە لەسەرپێچیکردنی سیستەمە یاساییەکانو ڕێککەوتنێکی گشتیش هەیە کە دەڵێت: گەندەڵی ڕێگرێکی خراپە لە بەردەم دەسەڵاتی یاساو زیانی زۆری پێدەگەیەنێت.
- پێناسەی گەندەڵی لە زانستی کۆمەڵناسیدا: لادان لە بنەماکانی ڕەفتاری کۆمەڵایەتی کە ئامانجی سەرخستنی بەرژەوەندی تایبەتە بەسەر بەرژەوەندی گشتیدا، بۆیە پسپۆڕانی کۆمەڵناسی دیاردەی گەندەڵییان بەوە پێناسە کر دووە، کە ڕەفتارێکی لادان بەدی دێت بە هۆی بێتوانایی لە جێبەجێکردنی ئامانجەکان، بە ڕێگا شەرعییەکان، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی پێناسەی گەندەڵی کراوە بە: (خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتو سوود وەرگرتنی نایاساییە، بە هۆی پلەوپایەی کە کەسێك هەیەتی لە پێناو خۆدەوڵەمەندکردنو دەستکەوتی تایبەتی ئەو دەسەڵاتە بەکاردەهێنێت)، هەروەها چەندەها پێناسەی تریش بۆ گەندەڵی کراوە، بەڵام یەکێکی تر لەو پێناسانەی کە دەتوانێت ماناو واتای گەندەڵی بەشێوەیەکی جوان بخاتە پێش چاو، دەڵێت: (بریتییە لە خراپ بەکارهێنانی دەسەڵاتە گشتییەکان بۆ بەدەستهێنانی دەستکەوتی تاکەکەس، یان گروپ لە ڕێگەی شاردنەوەی داهاتو خەرجیو نەبوونی شەفافییەت).

**بەندی سێیەم: جۆرەکانی گەندەڵی بە شێوەیەکی گشتی:**

یەکەم: هەندێ لە شارەزایان گەندەڵییان کردووەتە دووجۆر:

١- گەندەڵی کتوپڕ: وەك ئەنجامدانی تاوانێك، یان ڕەفتارێك لەناو یارییەکدا.

٢- گەندەڵی داڕێژراو: کە لە بواری ئابوورییە کاراکان بە دیدێت.

دووەم: جۆرێکی تر لە دابەشکردنی گەندەڵی:

١- گەندەڵی نێودەوڵەتی: بە هۆی سیستەمی ئابووری ئازادەوە ڕەهەندێکی جیهانی وەرگرتووە.

٢- گەندەڵی ناوخۆ: واتە دیاردەکانی گەندەڵی لە ناو یەك دەوڵەت.

سێیەم: هەندێ لە پسپۆڕان لقی جۆراو جۆریان لێکردۆتەوە، کە زۆر لە بوارەکانی ژیانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە: (گەندەڵی ئیداری، گەندەڵی سیاسی، گەندەڵی دارایی، گەندەڵی هزری، گەندەڵی پەروەردەیی).

جۆرەکانی گەندەڵی لە واقیعی ئەمڕۆی کوردستاندا:

(گەندەڵی سیاسی، گەندەڵی ئیداریو حکومی، گەندەڵی کۆمەڵایەتیو فەرهەنگی، گەندەڵی دادوەری).

**جۆرەکانی گەندەڵی بەپێی بڵاوبوونەوەی:**

**١- گەندەڵی نێودەوڵەتی:**

ئەم جۆرە گەندەڵییە زۆر فراوانە، جیهانییەو هەموو سنوورەکان دەبڕێت تادەگاتە بریتی قاڕەکان، کە پێی دەگوترێت: (عەولەمە) ئەویش بەکردنەوەی سنوور لە نێوان وڵاتان لە ژێر بیانووی ڕژێمی ئابووری سەربەخۆ، دەبەسترێتەوە بە دەزگاکانی ئابوری دەوڵەت لە ناوەوەو دەرەوەی وڵات، پابەندە بەسەرکردایەتی بۆ سوودمەندی ئابووری، ئەمەش زۆر زەحمەتە جیابکرێتەوە، ئەم گەندەڵییەش وەکو ئەختەبوت وایە، کە هەمووی بە یەکەوە دەبەستێتەوەو ترسناکترین گەندەڵییە.

**٢- گەندەڵی ناوخۆ:**

ئەمەش لە ناوەوەی وڵات بڵاودەبێتەوە، لە سەرچاوە ئابوورییەکان، بەپێی شوێنی کار (بچووك)، لەو کەسانەی کە پەیوەندیان نییە، لەگەڵ (دەزگاکانی جیهان) ئەنجام بدات لە ڕێگای:

بەرتیل: واتا بەدەستهێنانی سوودێکی دارایی بۆجێبەجێکردنی کارێك، کە پێشێلی یاسایەك، دەکات.

مەحسوبییەت: واتە جێبەجێکردنی داواکارییەکانی دەزگاکانو ڕێکخراوەکان لە ڕێگای دەسەڵاتەکانیان کە شایەنی نین.

- نزیکبوونەوەو خۆشەویستی: واتا هەڵبژاردنی کەسێك لەسەرحسابی کەسێکی تر، بەبێئەوەی مافی هەبێت، وەکو بەخشینی کاری بەڵێندەرایەتیو پەیمانی بە کرێدانو گەشەپێدان.

واستەکردن: واتا دەستێوەردانی کەسێکی خاوەن دەسەڵات (کاربەدەست، حیزبی) بۆ بەرژەوەندی کەسێك کە شایەنی دامەزراندن نەبێت، یان هەرکارێکی تر.

- سامان خواردنو تەزویرکردن: بە مەبەستی هێنانەدی پارەو پول لە کەسانی تر لە ڕێگای شوێنی کار، بە بیانووی یاسایی، یان بەڕێوەبردن، یان شاردنەوەی زانیارییە کارپێکراوەکان لە کەسانی پەیوەندیدار، هەروەك ئێستا کە لە فەرمانگەی باجەکان، یان تەزویرکردنی بڕوانامەی خوێندنو تەزویرکردنی پارە.

- خواردنو بردنی دارایی گشتی: بازاڕی ڕەشو بردنی پارە بۆ دەرەوە لە ڕێگای کەسانێك کە دەسەڵاتیان هەیە، بۆ ئەم کارەو یاریکردن بە سەروەتو سامانی دەوڵەت بە شێوەیەکی نهێنی بەبێ ئەوەی مافی ئەو بێت، یاخود بەڕێکردنی کەلوپەل لە ڕێگای بازاڕی ڕەش، یاخود بردنی سامانی نەوت.

- گەندەڵی لە ناوەوەی ژینگەی کۆمەڵگە: پیسبوونو دووکەڵی کارگەکان (وڵاتە گەورە پیشەسازییەکان ڕۆڵێکی گەورەیان هەیە لە نەبوونی دیاردەی هەوا گۆڕکێ) کە ئێستا جیهان بەم دیاردەیەوە دەناڵێنێت.

- کەمتەرخەمی لە جێبەجێکردنی مامەڵەکان: بە تایبەتی ئەوانەی گرنگو بە پەلەیە، وەکو مامەڵەی خانەنشینی، ڕەگەزنامەو پشتگیریو نووسراوە فەرمییەکان.

پلانسازی شار

# بیردۆزەکانی پلانسازی شار



بەشی سێیەم

ئا: بەهەشت عەلی

دوای لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی بۆ شارەکان لە سەدە جیاوازەکاندا، بۆمان دەردەکەوێت کە شار ڕووبەڕووی چەند بۆچوونێك بووەتەوە، کە لە کاریگەری کاتیو شوێنەوە هەڵقوڵاوەو پەیوەستن بە ئاینو سیاسەتو ئابورییەوە.

بە کۆمەڵێك شێوە دەرکەوتووە کە سەردەمەکەی کاریگەری لەسەری هەبووە، دوای ڕوودانی شۆڕشی پیشەسازی لە ئەوروپا کە کاریگەری لەسەر تەواوی جیهان بەجێهێشت چاخی نوێ ئاگادار دەکاتەوە کە پتەوی زانستو مەعریفە، پێویستە لەسەر پلانسازانو تەلارسازەکان کە بۆچوونەکانیان شان بە شانی ئەم گەشەیە بێت لە ڕێی گرتنەبەری، شێوازی شیکاری زانستیو خوێندنی ئەندازیاریو زانستی فەلسەفەو لۆژیكو کۆمەڵایەتی، بۆ گەیشتن بە باشترین چارەسەرو داهێنان کە دە توانن لە ڕێیەوە خزمەتی مرۆڤایەتی بکەن لە چوارچێوەی هاوشێوەی بیناسازی کە تیایدا دەژین..

لە جەرگەی ئەو کەشە زانستییەوە، کە لە سەرەتای سەدەی بیستەم سەری هەڵدا، چەندین بیردۆزی پلانسازی شار دەرکەوتن کە بۆچوونەکەی لە چوارچێوەی دوو بیرۆکە، یان دوو بیردۆزی بنەڕەتی بوون، یەکەمیان پشت بە بیردۆزی بڵاوبوونەوە، دووەمیان پشت بە چەقە بیردۆز دەبەستێت.

**بیردۆزەکانی پلانسازی:** دابەش دەبێت لە ڕووی ئاڕاستەوە بۆ دوو شێوە:

**١- بیردۆزەکانی بڵاوبوونەوە:** (لوید برۆدوین) لە کتێبەکەی (داهاتوی شار) ئەم بیردۆزەی شیکردۆتەوە، لەسەر بنەمای بڵاوبوونەوەی سەنتەرەکانی شار، لەسەر زەوی هەرێمو زۆرینەی سەنتەرە کۆنەکانی شاری چارەسەر کرد، بەشێوەیەك ڕێدەدات بە بڵاوبوونەوەی چالاکییە جیاوازەکان لە ڕێی هەرێمی هەر دامەزراوەیەکی کارگەکانو نووسینگە بەڕێوەبەرایەتییەکانو مۆزەخانەکانو زانکۆو نەخۆشخانەکان لە هەر شوێنێك، بەمە شوێنی نیشتەجێبوونو کارکردن لە یەکەوە نزیك دەبن. بڵاوکردنەوەی ئەم چالاکییە پشت دەبەستێت بە گەیەنەرەکان، بە تایبەتی هۆکاری گواستنەوە، ئۆتۆمبێلی تایبەت، بە هەمان جۆری بڵاوبوونەوەی هۆکاری خۆشگوزەرانی لە هەموو شوێنێكو دەبێتە هۆی دابەشکردنی چڕی دانیشتووان.

**بیردۆزی هێڵی:**

خاوەنی ئەم بیردۆزە ئەندازیار (سوریا ماتا)یە، ئەم بیردۆزەی لە ساڵی ١٨٩٢از خستەڕوو، ئەوەش نۆژەنکردنەوەی هەردوولای ڕێگەی گەیەنەری نێوان دوو شاری کۆن، بۆ دروستبوونی شارێکی تر ناونرا بە شاری شریتی. هەوڵدانە بۆ شێوەی سەنتەری (المرکزی)و گرتنەبەری شێوەی پلانی شریتی کە ئەو شارە درێژ دەبێتەوە بە درێژایی ڕێگاکە. لە هەردو لاوە ڕێگای کۆتا داخراوی لاوەکی لێ جیادەبێتەوە، کە شوێنی نیشتەجێبون بە چواردەوریدا دروست دەکرێت.

ئەم بیردۆزە جێبەجێ کرا لە ماستەرپلانی شاری مەدریدی پایتەختی ئیسپانیا کە شارە شریتییەکە دەکشێت لە هەردوولای ئەو ڕێیەی کە شارەکانی دەوروبەر بە پایتەختەوە دەبەستێتەوە.

ئەم هێڵە پلانسازییە دەگۆڕێت بۆ بازنەی نیشتەجێبوونی بەستراو بە ڤێلاکانەوە بە چواردەوری شارەکە، لە بری ئەوەی کە هەر شارێك داخراو بێت بە ڕووی شارەکانی تردا.

**نموونـەی جێبەجێکـراو لەسـەر ئەم بیردۆزە:**

شاری بورجی عەرەبی نوێ دەکەوێتە دووری ٦٠کم بە ئاراستەی ڕۆژئاوای شاری ئەسکەندەرییەو نزیکـەی ٧کـم دوورە لە کەناری دەریای ناوەڕاست، تایبەتمەندییەکەی ئەوەیە کە دەکەوێتە ناوچەیەکی بەرزەوە.

**تایبەتمەندییەکانی شاری هێڵی:**

فەراهەمبوونی جوانی دەشتو جوانی سروشت لە هەردوولای شارەکە.

دوورکەوتنەوەی خنکاندنی سەنتەر لە خزمەتگوزاری چڕی سەنتەر.

گرەنتیدابەشکردنیزەوینیشتەجێبوونو دابەشکردنی گونجاو لە ڕووی پەیوەندییەوە بە هێڵی هاتووچۆی سەرەکییەوە، توانستی هەموو نیشتەجێبوویەك بە چێژ بینین لە باخچەی دواوە.

گرەنتی پەیوەندی لە نێوان ناوچە بینایەیەکانو ناوچە سەوزەکان.

بەستنی شارە هێڵییەکە بە یەکەوە، جوولـەی ئۆتۆماتیکی کە درێـژ دەبێتەوە بەسەر هەموو نیشتەجێبووەکان.

**لایەنە نەرێنییەکانی شاری هێڵی:**

بەدەست نەهێنانی پەیوەندیو هاتوچۆی نێوان دانیشتووانی شار، بەهۆی درێژی ماوەوە.

بە دەستنەهێنانی پلەگەری جۆری (التدرج النوعی) لە ناوچەی نیشتەجێبوون هەموو وەك یەکن.

بە دەستنەهێنانی جیاکردنەوە لە نێوان ناوچەی نیشتەجێبوونو پیشەسازیو هتد.

**شاری باخچەیی:**

لەساڵی ١٨٩٨ (ابنزار هوارد) بە ڕەگەز بەریتانی بیردۆزی ئەم شارەی لە کتێبەکەی (ڕێگای زانستی بەرەو چاکسازی ڕاستەقینەیی) بڵاوکردەوە. پوختەی ئەم بیرۆکەیە پلانی شارێکە کە توانای بەشکردنی خۆیی هەیە، لە شارەکانی ترەوە دوورە. وتویەتی ئەو زەوییەی کە شارەکەو چواردەوری لەسەر دروست دەکرێت، دەبێت موڵکی گشتی کۆمەڵگا بێت، کۆی تەختی شارەکەی دیاری کردووە بە ٦٠٠٠ acre(فدان)، بەشی بینایی ١٠٠٠ acre، کە لە چواردەورەوە بە ٥٠٠٠ acreی زەوی کشتوکاڵی کە ٣٠٠٠٠ نیشتەجێبووی هەیە، بەدەر لە ٢٠٠٠ کە لە بواری کشتوکاڵدا کاردەکەنو پلانی شارەکە بەشێوەیەك داڕێژراوە کە شوێنی نیشتەجێبوون بە دەوری ڕووبەری سەنترالی کراوەیی، زاراوەی ڕووبەری سەنتراڵ (المساحە المرکزیە) گوزارشت دەکات لە گۆڕەپان کە لە نێویدا باخی تێدایە، بە چواردەوری بینا گشتییەکان کۆدەبێتەوە وەکو دادگاو کتێبخانەو مۆزەخانەو نەخۆشخانەو هۆڵی شانۆ دەورەدراوە بە باخچەی گشتی کە دوای ئەوە بازاڕی شار دێت. بەڵام شوێنی نیشتەجێبوونی تاکو درێژکراوە لە ناوچەی بازنەیی لە ناوەڕاستەکەیدا ڕێیەکی بازنەیی هەیە کە خوێندنگەو کڵێسەکان دەکەونە سەری، بەڵام کارگەکان دەکەونە سەر ڕێی بازنەیی دەرەوە کە بە چواردەوری شارەوە دێتە ناو شارەوەو بە شەش ڕێی فراوان کە بە سەنتەردا تێدەپەڕێت، چوارچێوەی دەرەوە دەبڕێت بە شێوەیەك شارەکە دابەش دەکات بۆ پارچەی نیشتەجێبووی دراوسێ بە یەکو چڕی دانیشتووان دەگاتە ١٤ خێزان/١ acre

**نموونـەی جێبەجێکـراو لەسـەر بیردۆزەکە:**

شاری welwyn garden city وێڵوینی باخچەیی، دروستکرا لە لایەن (هاوارد)ساڵی١٩٢٠ ئەمەش گەشەکردنی شاری لیتشۆردە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی ئینگلتەراوە، پلانەکەی گرنگییەکی جیهانی هەبوو، گەشتیاری لە سەرانسەری جیهان ڕادەکێشا، جێبەجێکردنی بیردۆزی پشتێنی هەمیشەیی زەوی کشتوکاڵی تێدایە.

**سەبێربە باخچەییەکان:**

(بیردۆزی ڕیمۆند یونیەن) ساڵی١٩٢٢ز دەرکەوتو یونیەن بە پێشەوای نیشتەجێکردن دادەنرێت، کە خاوەنی ئەم وتە بەناوبانگەیە «زیادەڕۆییو فەرەبالغی هیچ سوودێك وەدەستناخات» دوای پێویستی دەستگیرۆیی لە ژمارەی شەقامەکان کرد کە پێویست نینو گلدانەوەی شوێنی کراوەو باخی گشتیو یاریگاو پێشنیارکردنی بیردۆزی دروستکردنی سەبێرب لە دەوری شارەکان، هەروەها پێشنیاری پێویستی سەرپەرشتیکردنی فۆستنەوەی زەوی سەوز بە چالاکترین فۆستنەوە، ئەمەش لە ڕێگەی خاوەندارێتی دەوڵەت بۆ زەوی.

ئەم بیردۆزەش لە میسر جێبەجێ کرا، لە دروستکردنی سەبێربی میسری نوێ (مصر الجدیدە)وە لە ساڵی ١٩٠٥ز.

**شارە پاشکۆکان:**

لە ساڵی ١٩٢٢ بیردۆزی (ڕۆبەرت ویتن) بۆ شاری پاشکۆ دەرکەوتو لە هەمان چوارچێوەی بیردۆزی یونیۆن دەسوڕێتەوە. دەتوانێت زۆری نیشتەجێبوون لە شارەکان کەمبکاتەوە، هەروەها چالاکی بگوازێتەوە بۆ سەبێربو شارە پاشکۆکان، بۆئەوەی ئەم سەبێربانە بە شاری دایك ببەستێتەوە لە ڕێی هۆکاری گواستنەوەی خێراوە، وەك میترۆ، تونێل. ڕێی سەربەست، هێڵی ئاسنی.

**٢- چەقە بیردۆز (التمرکز - Centralization_):**

شاری نوێ بیرۆکەیەکە لە ساڵی ١٩٢٢ پێشکەشکرا، کە (لیکۆربوزیە) پلانە پێشنیارکارەکەی بۆ شاری نوێ گوزارشتە لە شارێك کە شوێنی ٣٠٠٠ ملیۆن سەرنشینی تیا دەبێتەوە، بە هەمان شێوە گوزارشتە لە باخچەی مەزن، لە ناوەڕاستیدا بینای باڵا(Skyscrapers)ی تیادایە بە بەرزی ٦٠قات، بە چڕی ١٢٠٠ سەرنشین/acre، ٥٪ی ڕووبەرەکەی بۆ باڵەخانەی گشتیو بەڕێوەبەرایەتییە، سەنتەری گەیاندنی سەرەکی زەمینی ئاسنیو ئاسمانی دەکەوێتە ئەم نێوەندەوە، دەورەدراوە بە تەلارە بەرزەکانو تەلاری نیشتەجێبوون بە بەرزی ٨ قات ڕێکخراوە لە پۆلی شوشەیی. ڕووبەری سەوز بە چڕی ١٢٠جێنشین/acre لە نێوانیدایە، لە دەوروبەری شارەکە کە دەکەوێتە دەرەوەی ناوچەی ڤێلاکان.

**شاری گەشاوە:**

ئەم بیردۆزە لە ساڵی ١٩٣٣ز کە دوای ١١ ساڵ (لیکۆربۆزییە) پلانە نوێیەکەی بەناوی شاری گەشاوە، پێشکەش کرد. ئەم بیردۆزە ناوبانگێکی گەورەتری بە دەستهێنا، بە پێشکەوتنی بیردۆزی شاری سبەی دادەنرێت، شارەکە خاوەن پێکهاتەیەکی کراوەیەو ڕیزی بەردەوام لە تەلاری خاوەن شانەی شوشەیی لەسەر زەمینی بۆشاییەکی کراوە.

بیردۆزەکانی لۆکور بۆزییە لەسەر بنەمای تێکەڵکردنی دەشتیو شارستانییەت بنیات نرابوو، بە جەخت کردنەوە لەسەر کشانی ستونی.

**شاری چڕی بەرز:**

بیردۆزی برایانی گودمان، گوزارشتە لە ناوەندی شارستانییەتێکی ئاڵۆزی پێکهاتوو لە تەلاری مەزن کە تیرەی هەریەکێکیان نزیکەی میلێکو بەرزیشیان ٢٥قاتنو تەلارەکان بەکار دەبرێن بۆ فرۆشگاو کارگەی بچوکو نوسینگە، فرۆشگاکان لە بەشی پێشەوەنو بەدوایدا وەرشەکان دێن لە بەشی ناوەڕاست، پاشان نووسینگەکان لە بەشە بەرزەکان دێن. تەلارەکان لەسەر بنەمای هۆکاری گواستنەوەی ئۆتۆماتیکی دیزاین کراوە، بە ئاسۆی ستونی لە خزمەتی پێکهاتەی داڕێژراوی مەزن بە بەرزترین پلەی تواناسازی، چواردەوری تەلارەکان تەختیی سەوزایی فراوان دایدەپۆشێت لە نێوەندیدا باڵەخانەی سەرگەرمیو هونەریو خوێندنگا هەن کە بە چواردەوریدا هەموو باڵەخانەی نیشتەجێبوونو بە چواردەوری ئەویشدا کێڵگەیە.



بەشی دووەم

ئا: نەریمان بەهرام

# کارگێڕی ئیلکترۆنی

### ١-٣ کۆمپیوتەر (Computer):

کۆمپیوتەر ئامێرێکە مرۆڤ بەکاریدەهێنێت (USER)، دەتوانێت زۆرترین کارەکانی ڕۆژانەمان بۆ جێبەجێ بکات. سەرەتای دروستبوونی وشەی کۆمپیوتەر (Computer) بە مانای ژمێریاری دێت، چونکە یەکەم جار بۆ کرداری (کەم، کۆ، لێکدان، دابەشکردن) جێبەجێ دەکرا. ئامێری (Abacus) کە لە شاری بابلی عێراق دروستکرا، کە ئەمیش کرداری ژمێریاری پێدەکرا.(١)

کۆمپیوتەر پرۆگرام دەکرێتو توانای چارەسەری گیروگرفتێکی دیاریکراوی زۆری هەیە، ڕۆڵی کۆمپیوتەر لە ئامێرێکی ژمێریاری سادەوە، گۆڕا بۆ بەڕێوەبەرێکی ئەلکترۆنی لە هەموو بوارێکی ژیاندا.

پرۆگرام کردنیش، واتای توانا بەکارهێنانی کۆمپیوتەرە بە پێی پێویستی بەکارهێنەرەکەی، وەرگرتنی چەندایەتییەکی گەورە لە زانیاریو جێبەجێکردنی فەرمانی هەمەچەشنە بە خێراییەکی نزیك بە خێرایی تیشك، لە ڕاستیدا واتای ڕێکخستنو بەڕێوەبردنو ئاراستەکردنی هەموو کارێکی بیرو بازوو، بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی، پرۆگرامکردن، یان پێدانی زەخیرەیەك زانیاریو فەرمانی (Instruction) بە کۆمپیوتەر، بۆ جێبەجێکردنی پرۆسێسێکی دیاریکراو لە بەرهەمهێنان، یان بەڕێوەبردندا، بە زنجیرەیەك لە سەر ئەو شێوازانەی ناو دەبرێت بەشێوازی خوارزمی (Algorithmic Mode)، کۆمپیوتەریش ئەم پرۆسەیە، لە زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەکی لۆژیکیدا ئەنجام دەدات، بە خشتەی ژوورەوە (input)و چارەسەری داتا دەست پێدەکات، بەهاتنەدەرەوەی داتا (output) کۆتایی دێت، هەر بەو مانایە پرۆگرامکردنی کۆمەڵێك هێماو دەربڕینی تایبەتی نییە، بەکاردەهێنرێت بۆ ئەنجامدانی پرۆسەی ماتماتیکیو لۆژیکی جیاوازەکان لە سەر ڕێو شوێنێکی دیاریکراو، لە ئەمڕۆدا پرۆگرامەکانی کۆمپیوتەر دابەش دەبن بە سێ جۆری جیاواز: (سیستەمی کارکردن (operation system)، بۆ نموونە: وەك ویندۆز (windows)، پرۆگرامی بەکارهێنان (Application) وەك مایکرۆسۆفت ئۆفس (Microsoft Office)، زمانە هەمەجۆرەکان (programming languages) بۆ نموونە سی پلەس پلەس (C++)، ڤیژوەل بیسیك (Visual Basic)، جاڤا (java) کە بە پرۆگرامکردنی ئینتەرنێت بەکار دەهێنرێت.(٢)

ئێستا کۆمپیوتەر چەندەها پێشکەوتنی بە خۆوە بینیووە، لە زۆر لایەن وەکو (خێراییو میمۆری ڕامو هاردو شێوازی دیکۆرات... هتد)، لە هەمان کاتدا هەوڵدراوە ئامێری کۆمپیوتەر بە شێوەیەکی گونجاو بچووککراوەتەوە کە پێی دەگوترێت لاپتۆپ، ئەم ئامێرەی کۆمپیوتەر لە توانایدایە کار ئاسانیمان بۆ بکات لە هەموو بوارەکاندا، بگرە ئێستا کۆمپیوتەر بۆ بوارێکی زۆرگرنگ بەکاردێت ئەویش (کارگێڕی ئیلکترۆنی)یە، چەندەها لایەنی تر.

لە کۆتاییدا دەتوانین پێناسەی بکەین بە ئامێرێك، یان چەند ئامێرێکی ئیلکترۆنییە، پێشوازی لە کۆمەڵێك زانیاری (Instruction) دەکات، بۆ چارەسەرکردنی (processing)، دەرخستنی بە شێوەی ئەنجامی تەواو کۆتایی.

### ١-٤ ئینتەرنێت (Internet):-

هەر لە سەرەتاوە مەیلی مێژووی کۆمپیوتەر داهاتووە کە توانای هەبێت ژمارەیەك کەس یەك سیستەمی کۆمپیوتەر بەکاربهێنن، ئەو مەیلە مێژووییە لەوەدا قوڵتر دەبێتەوە کە ئەو سیستەمە ئاڵۆزە. لە تۆڕێکی جاڵجاڵۆکەییدا، یەك دەگرێتەوە زانیاری دەگۆڕێتەوە، واتە لە باری پراکتیکییەوە، ئینتەرنێت لە ژمارەیەکی بێ ئەندازە لە تۆڕی کۆمپیوتەر پێکدێت. سەدانو هەزاران تۆڕی گەورەو بچووکی کۆمپیوتەر لە جیهاندا، لە تۆڕێکی بەرفراواندا یەك دەگرن کە ناو دەبرێ بە ئینتەرنێت. گەیاندنی زانیاریش لە سەر بناغەی ئەو پرۆتۆکۆلەیە کە بە (Transmission control protocol/ Internet protocol (TCP/P) ) ناسراوە. ئەو پرۆتۆکۆڵەش بۆ لە یەکتر تێگەیشتنی کۆمپیوتەرەکانە لەو سیستەمە بەربڵاوەدا. بەتایبەت کاری ئەو پرۆتۆکۆڵە ڕێکخستنی ئەو ناونیشانە تایبەتیانەیە کە دەدرێتە کۆمپیوتەرەکان لەو تۆڕەدا. واتە هەر وەك چۆن لە جیهانی پەیوەندییە تەلەفۆنییەکاندا،

هەمـــوو تەلەفۆنێك ژمارەیەکـــی دیاریکراوی هەیە، بـــەو ژمارەیە جیـــا دەکرێتەوە لەوانی دی، ئـــا بەم چەشـــنە هەمـــوو کۆمپیوتەرێك ناونیشانێکی تایبەتی خۆی هەیە کە لە هەموو ئەوانی تر جیاوازە، ناونیشانەکانیش، بە پێی گەورەییو بچووکـــی تۆڕەکە دابەش دەبن بە چەنـــد جۆرێکی جیاوازەوە کـــە ناودەبرێ بە کلاسی ناونیشانەکان (addresses class)، ئەوانیش (A،B،C،D،E)یە. ئەم ناونیشانانەی لە ســـەرەتادا بـــۆ پڕکردنەوەی پێویســـتی (٤) ملیـــارد کۆمپیوتەر بـــوو لە جیهانـــدا. بەڵام زۆری نەبرد ئەم ڕێژە دیاریکراوە گیروگرفتی دابەشکردنی ناونیشانی نوێی هێنایە پێشەوە، چونکـــە هەرگیـــز بە بیری کەســـدا نەهاتووە بەو خێراییەی ئێســـتا. ئینتەرنێت بەرفراوان بێت، بۆیە لەم دواییەدا چارەســـەرێکی نوێیان بۆ ئـــەو بارە دۆزییـــەوە کە نـــاو دەبرێت بە ((IP-Version (IPV) واتا ڤێرمشـــونی، کە ژمارەیەکـــی ئێجگار زیاتری لە کۆمپیوتەر لەو تۆڕە فراوانەدا کاری پێدەکات.

ئەم داهێنانەیە (لە ســـەرەتای ساڵی (١٩٦٩) کە لـــە لایەن وەزارەتی بەرگـــری ئەمریکییەوە هەوڵی بۆ درا هەتاوەکو ئامێرێکی لاسلکی سودی لێوەربگرنو لە بواری جەنگدا بەکاری بهێنن).

نووســـەرێکی تـــر لـــە پەرتووکەکەی بەم شـــێوەیە پێناســـەی ئینتەرنێتـــی کـــردووە، (ئینتەرنێـــت یەکێکـــە لـــەو هۆکارانـــەی کە بـــۆ زۆر مەبەســـت بەکاردەهێنرێـــت، هەر لە وەرگرتنـــی زانیـــاری (information)ی جۆراوجـــۆرەوە، گەڕان بە دوای زانیارییەکاندا تا پەیوەندیکـــردن (communication )و گۆڕینەوەی بیروڕاکانو گفتوگۆکردن).

بریتییە لە کۆمەڵێك زانیاری کە لە لایان چەندەها کەســـەوە ئامادەکراوە بۆ خوێنەر لە سەرتاسەری جیهاندا، دەتوانیت ئەم زانیاریانە وەرگری لە ماوەیەکی کورتدا، جا زانیارییەکان تاك بێت، یان گشتی بێت، لە گشت بوارێکدا.

هەروەهـــا پێناســـەیەکی دانپیانـــراوی دیاریکراو بـــۆ ئینتەرنێت لە ئارادانییە، بەڵام پسپۆرانی ئەو بوارە کۆکن لە سەر وەسفکردنی بـــەوەی کە تۆڕێکە لە تـــۆڕەکان (network of network). بەڵکـــو تـــۆڕی دایکـــە، واتە دایکـــی هەمـــوو تۆڕەکانـــە، کە لـــە هەناویدا ملیۆنان سیستەمی کۆمپیوتەرو تۆڕەکانیان لە گـــەڵ یەکتردا، بە یارمەتـــی هێڵە تەلەفۆنییە ئاساییەکان، بەشێوەیەکی بەردەوام لە کاردایە بۆ دەســـتەبەرکردنی پەیوەندییەکان لە نێوان سەرجەم لایەنەکانی تۆڕەکەدا. تۆڕیش بە پێی زاراوەی زانیارییەکان، گوزارشـــتە لە کۆمەڵێك کەرەســـتەو بابەتی زانیاریـــی ئامێزی پێکەوە گرێدراوە، جا ئەگەر چی تۆڕەکان ناوچەیی بن (Local area network) یاخـــود فراوان (wide area network)، بـــەڵام هەر وەك ئاماژەمان بۆ کرد، ئەو تۆڕەیە کە ســـەرجەمی جیهان دادەپۆشێت.

سەرەڕای ئەو پێشکەوتنەی کە ئینتەرنێت ڕۆڵـــی گواســـتنەوەی زانیارییـــەکان لـــە نێوان کۆمەڵگای جیاواز هەیە، بەڵام ئەم تەکنەلۆژیایە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر لە بەرەو پێشکەوتندایە، ئەوەتـــە بە هـــۆی ئینتەرنێتـــەوە خوێندکارو قوتابیـــانو گەنجـــانو زانایانو مامۆســـتایانو سیاســـەتمەداران، لە ڕێگای ئـــەم تەکنەلۆژیایە لـــە ماوەیەکـــی زۆر کەمدا چەندیـــن زانیاری وەردەگـــرن، گۆڕینەوەی زانیارییەکان لە نێوان خۆیاندا، یەکێك لە گرنگترین بەشی ئینتەرنێت ئەوەیـــە کـــە ڕۆڵێکـــی زۆری هەیـــە، ئەویش کارگێـــڕی ئیلکترۆنییە، هەروەهـــا ئینتەرنێت بۆتـــە هۆیەك بـــۆ کەمکردنـــەوەی ئەرکەکانی بەڕێوەبەران، کارمەندان هەر لە (دۆســـییەی ناردنو دۆســـییەی وەرگرو فەرمانو داواکاریو دامەزراندنو گواســـتنەوەو ڕاپـــۆرت ...هتد) لە سەرانســـەری جیهاندا، بۆیە ئەم تەکنەلۆژیایە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر لە پێشکەوتندایە.

| ناوی وڵات | ١٩٩٩ | ٢٠٠٣ |
|---|---|---|
| ئەمریکا | (٥٦٠) هەزار | (٧٣،١) ملیۆن |
| ئەوروپای ڕۆژئاوا | (٩١) هەزار | (٧٢،٠٠) ملیۆن |
| ئاسیای باسفیك | (٤٦٠) هەزار | (١٤٣،٤) ملیۆن |
| ژاپۆن | (٣،٨) هەزار | (٤٠،٩) ملیۆن |

خشتەی (١)، بەشدار بووانی ئینتەرنێت دکتور:نجم عبود نجم/ الإداره الإلکترونیه / چاپی یەکەم (٢٠٠٤)،الریاض / لاپەرە (٢٦).

### ١-٥ کـــــات (Time):-

بیرۆکەی کات لە دێـــر زەمانەوە زۆربەی زاناو فەیلەســـوفەکانی ســـەرقاڵکردووە، پێش زانینی (أرســـطو طالیسی)،(٣٨٤-٣٢٢ پ.م) وای لێکداوەتـــەوە بە ژمێرەری کات، لە چاخەکانی ناوەڕاســـت ((إســـحاق نیوتـــن)،(١٦٤٢-١٧٢٧ م) هاتو وای دانا کە لە شتێکی بەهادار دەچێت، بە شوێنکەوتەییو خۆ پێوەنوساندن بە خۆیو بێ گوێدانە هیچ هۆکارێکی دەرەکی، لە چاخی نـــوێ، کات (١٧٤٢-١٨٠٤م) وای بـــۆ دەچێت کە کات شـــتێکی بابەتـــی نییـــە کە لـــە خۆیەوە دامەزرابێت، کات لە بنچینەوە دەگەڕێتەوە بۆ کاری عاقڵ.

ئـــەوەی کە بـــۆی دەچێـــت (جولی هتدی یونکاریـــە)،(١٨٥٤-١٩١٢م) کە دەڵێـــت: (لێرەدا هیـــچ ڕێگایەك نییە کە بە کات دیاری بکرێت ڕاستتر بێ لە پێوانەی کات).

(ألبرت أنشـــتاین)،(١٨٧٩-١٩٥٥م) پێناسەی کات دەکاتو دەڵێت: (بۆ هەموو بارســـتەیەك گەڕانەوەیەکـــی زەمەنـــی خـــۆی هەیەو بەبێ یاسای پێشینەی بارستەکان)، دیاریکردنی کاتی تایبەت بە ڕووداوێکی دیاریکراوی بارستەیەك، دوای ئەمـــە پەیوەندی لە نێـــوان مرۆڤەکانو ئامێـــرو کات بـــەدی هـــات لە دروســـتبوونی پەیوەندی سێ لایانە.

بـــۆ دیارخســـتنی گرنگـــی کاتو زەمـــان بەوەی ڕەگەزی کاریگەری بوونەوەرن، کارێکی گرانـــە دیاریکردنی بیرۆکەیەکی دیاریکراو بۆ کات. بەشـــێوەیەکی گشتی بیرۆکەی کات ئەوە دەنوێنێ بە پەیوەندی دروست، یان ڕووداوێکی تر. بەشـــێوەی ڕابردوو، یـــان ڕانەبردوو، یان داهاتوو، دەردەبڕێت، لەبەرئەوەی کات دەبێت بـــە پێوەرێك بۆ ســـوڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆر. پێوەری پێوانەی کات بە کاتژمێر ناسراوە لەگـــەڵ بـــە شـــەکانی کاتژمێر بـــە مەرجێك یـــەك ڕۆژ نیشـــانبدات (٢٤)کاتژمێـــرو یەك مانگ (٣٠) ڕۆژو یەك ســـاڵ (١٢)مانگ بەوەوە کات بەســـەردەچێت بەڕێـــكو پێکـــی بـــەرەو پێشـــەوەو بێ دواکەوتنو پێشـــکەوتن. ناکرێ بە هیچ شـــێوەیەك ڕاوەستانو خڕبوونەوە لە بەرچاونەگرتنی، یان گۆڕینی.

کات بابەتێکی گرنگو بەهادارو بەسوودە لە ژیانی مرۆڤدا، بۆیە کەمی کات لە زانســـتی ئابووری بە کەمی کەلو پەل دەناسرێت، بۆیە زانایانـــی ئابووریناســـان دەڵێـــن: (دەبێت ئەم کـــەلو پەلە بەرجەســـتە بکرێو ســـوودی لێ ببینێ کە کۆمەڵـــگا هەوڵدەدات بەدی بهێنێت بە شێوەیەکی گشتی.

لەبەرئەوەی کات کەلوپەلێکی بەرجەستەیە بۆ هەموو کەســـێك بەشێوەیەکی گشتی. بۆیە دەبێت هەموو ئەو توانایانە بەرجەستە بکرێو کارابکرێ.

چەمکـــی کات: بریتییە لـــەو کاڵا ئازادەی کە ناکڕێتو نافرۆشـــێت بە جۆرێك تۆ هەمان ڕێژەو ئەندازەی کاتت دەست دەکەوێت کە واتا یەکێکی تر دەتوانێت دەستی بخات.

بـــەڵام چەمکـــی کارگێـــڕی کات: ســـوود بینینی باشـــترە بۆ ســـەرچاوە، دەســـتهاتە بۆ بـــوارە گونجـــاوەکان، چونکـــە ناوەڕۆکەکـــەی بریتییـــە لە پلاندانانو ڕێکخســـتنو گونجانو ڕێكوپێککـــردنو ئاڕاســـتەکردنو چاودێـــریو ئامادەکـــردنو پەیوەنـــدی گەیاندنـــە، ئـــەو بەڕێوەبەرانەی کـــە دەیانەوێت کاتەکانیان بە (ئەکتیڤی)*و چالاکی بەڕێوەبەرن.

کەواتەبۆمان دەرکەوت کات چییەو گرنگی چییە، لـــە بەرگرنگی کات زۆربـــەی زانایانو فەیلەســـووفەکانو نەتەوەکان چەندین وتەیان لـــە ســـەر کات گوتـــووە، لەوانـــە (کات ئەگەر نەیبـــڕی، دەتبڕێـــت)، (ئەوەی کە بە ڕاســـتی موڵکـــی ئێمەیە کاتە، تەنانـــەت ئەوەی هیچی نییە کاتی هەیە، یان خەفەت خواردن بۆ کاتی بەسەر چوو کات بە فیڕۆدانێکی ترە).

هەروەهـــا (ابـــن القیـــم) ڕەحمەتی خوای لێبێت لە کتێبی (الفوائد)دا دەڵێت: (بە فیڕۆ دانی کات، زیانبەخشـــترە لە مـــردن). کەواتە کات لە ڕووی کارگێڕی ئیلکترۆنی زۆر گرنگە، یەکێك لـــە گرنگییەکانی کارگێڕی ئیلکترۆنی ئەوەیە کارەکان بە خێرایی دەکرێت.

# سەرۆکایەتیی شکستخواردوو!

نەسیم سەمادی

دەپرسین: سەرۆکە شکستخواردووەکان، بۆچی بیرێك لە هۆکاری شکستیان ناکەنەوە؟ وەڵامەکەی زۆر بە سادەیی، ئەوەیە: (شکستخواردووەکان بیر ناکانەوە!) ئەوانە لەبەرئەوە شکست ناهێنن، کە بیر ناکەنەوە، بەڵکو ئەگەر بیشیانەوێت، ناتوانن بیربکەنەوە.

ئەو دەمەی لە پێگەی (تید.کۆم)دا، تەماشای کۆڕێکم کرد، بۆم دەرکەوت کە تا ئێستە نەمزانیوە.. قەیتانی پێڵاوەکانم ببەستمو ٩٩٪ی نەوجەوانانیش، نازانن چۆن قەیتانی پێڵاوەکانیان ببەستن.

لەو کۆڕانەی سەبارەت بە (تۆکمەکردن) دەیبەستم، دەپرسم: (مەیموون بۆچی لە ئادەمیزاد باشتر، مۆز پاك دەکات؟) وەڵامەکەی ئەوەیە: (خەڵکی لە مەیموونەوە فێرنابن)، جارجارەش دەپرسم: (کێ دەزانێت ئەم کاتژمێرە، بۆچی لەناو دەستمدایە، پێی دەبەخشم!) هەمووان لە وەڵامدا دەڵێن: (تا کاتی پێ بزانیت)، هەردەم وەڵامی هەڵە دەدەنەوە.. خۆ ئەگەر زانینی کات هۆکارەکەی دەبوو، ئەوا کاتژمێرەکەم، لە مەچەکمدا دەبوو.

دەی لە جیهاندا، بۆچی سەرۆکە شکستخواردووەکان، بەرچاو دەکەون؟ سەرۆکە خراپەکان، شوورەییو نەنگیی خۆیان نابینن. ئەوانە کۆمەکی هاندەرەکانی خۆیان ناکەن، ئیدی لە گریمانەی هەڵەوە بڕیار دەدەن. سەیرێکی کاربەدەستو سەرۆکی ئەو بانكو کۆمپانیایانە بکەن، کە نابووتو مایەپووچ بوون، هەموویان وادەزانن سەرۆکایەتیی دەوڵەتو ڕێکخراو، وەك کارپێکردنی ئۆتۆمبێلە.. لە کاتێکدا سەرۆکایەتی، زنجیرەیەکی یەك لە دوای یەکی بڕیاردانە! بەڵام بەرلەوەی کارەسات بکەوێتەوەو سەرۆك لەگەڵ دیواردا پێکدا بدات.. کەسێك نییە فیکەی وریاکردنەوە لێ بدات.

ئەو سەرۆکانە، هەروەك هەموو کەسێك، چوار پاڵنەر، ڕاپێچیان دەکەنو پێش خۆیان دەدەن. ئەم پاڵنەرانە، قیبلەنمای ناوەوەیان، تەنها بەو ئاڕاستەیەدا دەبەن، کە وا گومان دەبەن، زۆر بێوەیترە، مانەوەی مسۆگەرترە، بڵندبوونەوەی باشترە، ئەوانیش:

١- قۆرخکردنی سەرچاوەکانی ژیان.
٢- بەرگری لەخۆکردن.
٣- کارلێککردن لەگەڵ کۆمەڵگەدا.
٤- هەوڵی حاڵیبوون لە جیهان.

لە دەستبەسەراگرتنی سەرچاوەکانو بەرگری لە خۆکردندا، مرۆڤ لەگەڵ ئاژەڵدا، برابەشن. هەرچی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیو بیرکردنەوەی فەلسەفی لە ئایندەو شتی ڕەهایشە، مرۆڤ لە ئاژەڵ، جوێ دەکاتەوە. خۆ ئەگەر کەسێکمان، یەکێك لەم دوو پاڵنەرەی دوایی لەدەست دا، یەکسەر دەبێت بە نیوەمرۆڤ.. بەڵام ئەگەر هەردووکیانی نەما، دەسبەجێ دەگۆڕێت بۆ ئاژەڵ.

لەم سێ ساڵەی ڕابردوودا سەرنجمان داوەو لەم چەند مانگەی پێشوودا، جەختمان کردووەتەوە، کە بیرکردنەوەی تاکڕەوانە، سیاسەت هەڵدەسوڕێنێتو بیرکردنەوەی ئابوورییانە، لە جێی کارگێڕی بڕیار دەدات. واتە: پاڵنەری یەکەمو دووەم، بەسەر جیهاندا زاڵن.. مرۆڤیش لەبەر پێشکەوتنو ململانێو جیهانگیری لە وزەبەدەر، دەبێتەوە بە کەسێکی سەرەتاییو ڕواڵەتبین.. مرۆڤێك کە هەروەك کەسە سەرەتاییەکان، هێشتا فێر نەبووە، چۆن قەیتانی پێڵاوەکانی ببەستێت.

سەرۆکایەتیی خراپو بارکەوتوو، ڕەنگدانەوەی باری سرووشتیی مرۆڤە، چونکە مرۆڤ، کە هەستکردن بە کەسانی دیکە لە دەست دەدات، بڕیارە خراپەکان دەردەکات، ئەوەش بە هۆی گوشاری خۆبەخۆیە، کە ناتوانێت دەستی لێ هەڵبگرێت.

ئێستە دەزانین، نموونەی ئەم سەرۆکانە، بایەخ بە سامان (سەرچاوەکان) دەدەنو دەستبەرداری کورسییەکانیان نابنو لە ئایندە دەدوێن، (دەزانن کە لەم گەردوونەدا، بوونەوەرێکن).. بەڵام لەهەمبەر کەسی دیکەدا، موچوڕکەیان پێدا نایەتو ناخرۆشێن. ئاخۆ نموونەتان دەوێت؟ سەرنجی دەنگوباسی بەیانیو ئێوارە بدەن، کێتان دەوێت لەوانەی لە کونجی زینداندا توندکراون، بیریان لێ بکەنەوە. بیرێکیش لە «شتراوس کان»ی سەرۆکی بانکی نێودەوڵەتی دراو بکەنەوە، کە شێتی سەری لێداوە.



ن: عبد العزیز بن راشد الرشید
و: یوسف هەریری

# پەیوەندییە کارگێڕییەکان



* چەمکی پەیوەندیکردن:

کرداری ناردنو وەرگرتنی زانیاریو هەستەکانو ئاراستەکردنی، پێویستە بۆ مومارەسەکردنی ئەرکی کارگێڕی جیاواز.

«بورتش» پەیوەندیکردن پێناسە دەکات بە: (کرداری ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان لە نێوان نێرەرو وەرگرو دەرککردنی ناوەڕۆکی ئەو کردارە).

* ئەوەی تێبینی دەکرێت لە پێناسەکانی پێشوودا:

پەیوەندیکردن هۆکارێکە بە هۆیەوە دەتوانرێت تێکەڵبوونو ئاڵوگۆڕکردنی زانیارییەکان لە نێوان تاکو کۆمەڵەکان باش بکرێت، بۆ هێنانەدی دەرەنجامی باشو پەیوەندی باش لە نێوانیاندا. پەیوەندیکردن کردارێکە ڕوودانی تێکەڵ بوون بە مەرج دادەنێت، بە هۆی کارتێکراوەکانو وەڵامدانەوە ئاڵوگۆڕکراوەکان لە نێوان تاکەکان، ئەمەش تەواو دەبێت بە وەرگرتنو بەخشینی ئاڵوگۆڕکراوە.

بۆیە پێویستە لە سەر بەڕێوەبەری کارگێڕی کە مانای ڕاستەقینەی کرداری پەیوەندی باش بزانێت کە:

بریتییە لە کرداری ناردنو وەرگرتنی زانیاریو هەستکردنو ئاراستەکردنو ڕەنگدانەوەکانی لە وێنای ڕەهەندەکانی ئاکاری پەیوەست کە یارمەتی کێشانی نەخشەو وەرگرتنی بڕیار دەداتو ئاراستەکردنی هەوڵو تێکۆشان بۆ ئامانجەکانمان.

* قۆناغەکانی کرداری پەیوەندیکردن:

- کەناڵەکانی پەیوەندیکردنو هۆکارەکانی.
- مەرجەکانی پەیوەندیکردنی چالاک.
- بەربەستەکانی پەیوەندی کردنی چالاک.

کەناڵەکانی پەیوەندیکردن:

١- نێرەر- (پەیام، بۆچوون، هەستەوەرەکان، زانیاری، ڕاستییەکان، ڕێنمایی- گۆڕان بۆ نیشانە- هۆکاریی ناردن).

٢- وەڵامدانەوە- تێگەیشتنی پەیام، شیکردنەوەی نیشانە- وەرگر.

* پەیوەندییەکان کاتی جیاجیای هەیە، لێرەدا گرنگترینیان باس دەکەین:

أ- پەیوەندی کردنە نزمەکان.

ب- پەیوەندی کردنە بەرزەکان.

* چەند مەرجێک هەیە، دەبێت بوونیان هەبێت لە پەیوەندی کردنە بەرزەکاندا لەوانە:

١- باوەڕپێهێنانی کارگێڕی بە گرنگی ئەم پەیوەندی کردنانەو پێدانی هەلی گونجاو بە فەرمانبەرەکان بۆ بەرزکردنەوەی زانیاری گونجاو. هەڵسەنگاندنی ئەم زانیاریانەو وەرگرتنی بڕیاری گونجاو.

٢- پەیوەندی کردنە ئاسۆییەکانو ناوەوەو دەرەوەو فەرمیو نافەرمی.

هۆکارەکانی پەیوەندیکردن:

- دانیشتنە پەروەردەییەکانو فێرکردن.
- لیژنە پەروەردەییەکان.
- ڕاپۆرت.
- کۆبوونەوەی فوتابخانەکان.
- چاوپێکەوتن.

مەرجەکانی پەیوەندیکردنی ئەکتیف:

- دڵنیابوون لەو پەیوەندییەی کە ئەنجامی دەدەین بە مەبەستی جێبەجێکردنی ئەو ئامانجەی کە لە پێناویدا ئەم پەیوەندییەمان ئەنجامداوە.
- زانینی تەواو بەو زانیاریو داتایانەی کە پێویستە بگەیەنرێت بە کەسانی تر.
- هەڵبژاردنی شێوازی پەیوەندیکردنی گونجاو بۆ هەر هەڵوێستێك.
- وردیو تێگەیشتنو ڕوونی ئەو زانیاریانەی کە نێرراوە لە لایەن نێرەرەوە، بۆ کەمکردنەوەی لێکدانەوەی هەڵەو خراپ تێگەیشتن بۆ مانا ڕاستییەکەی.

بەربەستەکانی پەیوەندیکردنی ئەکتیف:

لێرەدا زۆر هۆکار هەیە وایکردووە پەیوەندیکردنی ئەکتیف بگۆڕێت بە بێ تەواوبوونی ئەم کردارە، کە ئەمانیش دوو هۆکارن:

- بەربەستە تاکییەکان.
- ئەو بەربەستانەی پەیوەستە بە ژینگەی کارکردنەوە.

یەکەم: بەربەستە تاکییەکان:

أ- زمان.

ب- ئارەزوو و مەیلی تاك.

ج- توانای تێگەیشتن.

د- پەیکەری ڕێکخستن.

هـ-بەکارنەهێنانی هۆکاری پەیوەندیکردنی گونجاو.

و- سیفەتە کەسییەکانی فەرمانبەرو سروشتی کار.

ز- ترس.

دووەم: ئەو پەیوەندییانەی پەیوەستن بە ژینگەی کارکردنەوە:

أ- کەسی کارگێڕی بەرز.

ب- نەبوونی سیاسەتێکی ڕوون بۆ پەیوەندیکردن.

ج- ئەکتیف نەبوونی سەرکردایەتی.

کێشەکانی پەیوەندیکردن:

١- کێشە هونەرییەکان کە پەیوەستن بە مەودای گواستنەوەی نیشانەکان بە وردی.

٢- کێشە زمانەوانییەکان تایبەت بە واتاکان (Semantic) کە پەیوەستن بە هەڵگرتنی ئەو نیشانانەی مانای باشیان هەیە.

دەتوانین بارودۆخێکی گونجاو بڕەخسێنین بۆ تێگەیشتنی تەواو؟

کێشەکانی تایبەت بە ماناکان چارەسەردەکەین؟

ئەمەش دەوەستێتە سەر ئەم هۆکارانە:

أ- لێکچوونی شارەزایی پێشترلە نێوان هەردوو لایەنی پەیوەندی کارەکە.

ب. ئەو ناوەندەی کە ئەو پەیوەندییەی تێدا کراوە.

ج- جیاوازی نێوان ڕاستیو بۆچوونەکان.

د- پلەی هەژماری نیشانە بەکارهێنراوەکان.

هـ- پلەی ئاڵۆزی واتا بەکارهێنراوەکان.

پەیوەندییەکان بەشێکن جیا نابنەوە لە سروشتی کار، هەرچەند پەیوەندی کردنەکان ڕاستەوخۆ بن، ئەوە زیاتر ئەکتیف دەبن.



# بڕیاردان لە ناخدایە

عبدالمناف عبدالعزیز

بڕیاردان لە مرۆڤدا هەموو ئەو هۆکارو پاڵنەرانەن کە چۆنییەتی بیرکردنەوە دیاری دەکاتو گفتوگۆو ڕەفتاری مرۆڤ سنووردار دەکات، ئەویش بریتییە لە بەرنامەڕێژی خود، هەر ئەو بەرنامەڕێژییە کەوا لە مرۆڤ دەکات کەسێکی ئەرێنی بێت، یاخود کەسێکی نەرێنی بێت بۆ خۆیی‌و دەوروبەری. لە زانستی بەرنامە ڕێژی زمانی دەماریدا، بۆ ئەو بابەتە بنەمایەکی زانستی هەیە دەڵێت: (من بەرپرسم لە ژیری خۆم، کاتێك من بەرپرسم لە کردەوەکانم)، کەواتە بێگومان بیرکردنەوەکانت لە ژێر ڕکێفی خۆتدایە، خۆت ئاراستەی بیرکردنەوەکانت دیاریی دەکەیت، کەواتە بەم شێوازە دەتوانی ئەزموونی ژیانت پڕ بێت لە سەرکەوتنی لە یاد نەچوو، چونکە بیرکردنەوەکانت چێوەی ڕەفتارەکانت دیاری دەکات کاتێك بیرکردنەوەت ڕاستو دروست بوو ئەوا ڕەفتارەکانت دروست دەبێتو لە سنوری ئاکاری‌و شێوازی دروستی ژیان دەرناچێت.

شێوازی بیرکردنەوەی دروست لە ژیانی هەریەکێکمان کارێکی ئەستەم نییە، گەورەترین هۆکار کەوا لە مرۆڤ بکات، بڕیارەکانی ژیانی بۆ هەر بابەتێك بە دروستی بدات، تەنها باوەڕبوونە بە توانای هێزی ناوکی خودی‌و شێوازی دروستی بیرکردنەوەکانت، چونکە مرۆڤەکان لە شێوەو پێکهاتەیاندا وەك یەك لە لایەن خوای کردگارەوە دروستکراون، وەك هەردوو نووسەری بە ناوبانگ جاك کانفیلدو مارك فینس دەڵێن: (ئێمە هەموومان یەکسانین کە خاوەنی ١٨ ملیۆن خانەی ژیرین، هەر ئەوەمان لەسەرە کە چۆن بەکاریان دەهێنین).

کەواتە دوای بیرکردنەوەی دروست پێویستە بڕیار بدەیت کە کارەکە جێبەجێ بکەیت، بەڵام شێوازی بڕیاردانت دەبێت لەسەر بنەمای باوەڕبەخۆبوون بێت، ڕەنگە زۆرکات تووشی ئەو گرفتە بووبیت کە بڕیارت داوە کارێك ئەنجام بدەیت، بەڵام کاتێك هەستت کردووە کە ئیرادەی ئەنجامدانی ئەو کارەت نییە، بە دڵنیاییەوە ئەو هەستە بە پێی مرۆڤەکان دەگۆڕێت، ڕەنگە هەندێکیان تەنها سەرزارەکی بڕیار بدەن، توانای خۆیان بەکارنەهێناوە، یان هێزی باوەڕبەخۆبوونیان نییە، ....هتد، یاخود بڕیارەکەت جێبەجێکردووە، بەڵام توانای بەردەوام بوونت نییە لەسەر کارەکە، ئەوەش کێشەیەکی ترە کە ئەمڕۆ ڕووی لە زۆرێك لە مرۆڤەکان کردووە، بەڵام ئەوە مانای ئەوە نییە کە مرۆڤەکان دەستەوەستان بن، بەڵکو دەبێت بەردەوام بین لە کۆششکردن.

بە بڕوای من یەکێك لە هۆکارەکانی تر بۆ دروستبوونی ئەم کێشەیە کە ڕێگرە لە گەیشتن بە ئامانجەکانت، ترساندنی ناوەکیتە کە بریتییە لە ناردنی پەیامی نێگەتیف بۆ بیرکردنەوەی ناوەکی، وەکو بە ڕاستی من کەسێکی لاوازم، من کەسێکی شەرمنم، من ناتوانم لە بەرامبەر جەماوەردا قسە بکەم.... هتد. کە ئەوە مەترسیدارترین کارە کە مرۆڤ ئەنجامی بدات، چونکە بەڕاستی تواناکانی مرۆڤ لەناو دەباتو ڕێگری لە بەرکارهێنانی هێزی ناوەکی دەکات، بۆیە پێویستە بە هەرشێوازێك بێت ئەو ترساندنی ناوەکییە بگۆڕێت بۆ وەرگرتنی پۆزەتیف، کە بریتییە لە ناردنی پەیامی پۆزەتیف وەکو من کەسێکی بەهێزم، من دەتوانم لە بەرامبەر جەماوەردا قسە بکەم. بەو شێوازە دەتوانیت پەرە بە تواناکانت بدەیتو ئامانجەکانت بپێکیت.

ئێستا تەنیا گوێبگرە، کاتێك پێویستە بڕیار لەسەر بابەتێك بدەیت، پێویستە لە ناخی دڵتەوە بڕیابدەیتو بە ئامانجەوە بژیت، پاشان بەردەوامبیت لە کارەکەتدا، هەروەك (د.ڕوبەرت سۆلەر) دەڵێت: (دەتوانیت هەرکارێك بکەیت تەنها بڕوات وابێت دەتوانی ئەنجامی بدەیت، ئارەزووی دروستکردنی هەر شتێك دەکەیت، دەتوانیت دروستی بکەیت، تەنها بڕوات هەبێت کە دەتوانیت دروستی بکەیت، دەتوانیت بە دەستی بهێنیت تەنها بڕوات هەبێت کە توانای بەدەستهێنانت هەیە، هەموو ئەمانە لە سەر بیرباوەڕەکانت وەستاوە).

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەو کەسانەی تاکو ئێستا سەرکەووتوو نەبوون لە بڕیارەکانیاندا، تکایە ئەو کارە ئەنجامبدە، چونکە ئەوە فەرمانی پێغەمبەری خۆشەویستمانە (سەلامی خودای لێبێت) دڵنیابن کە سوودتان پێدەگەیەنێت. یەکێك لە شەوەکانی تەمەنت تەرخان بکە بۆ ئەو کارە، ئەمشەوە خەو لە خەیاڵتدا ببەرە دەرەوە، لە کۆتایی شەوەکەدا بیرکردنەوەکانت قووڵتر بکەرەوە، بڵێ بۆچی من ناتوانم ئەو کارە ئەنجامبدەم؟ ئایا بۆچی من ناتوانم هێزی بڕیاردان لە خودی خۆمدا دەستەبەر بکەم؟ بەردەوامبە لە بیرکردنەوەکانت تاکو سێ بەشی شەو تێدەپەڕێت، ئینجا لە ناخی دڵتەوە بپاڕێرەوەو دەستەکانت بەرزبکەرەوەو بڵێ: ئەی پەروەردگاری جیهانیان، پشتیوانم بە بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە، لەو کاتەدا هەر شتێك لە ناختایە دەریبهێنە...

بەڵام گرنگترین بابەت کە پێویستە بیرمان نەچێت، ئەوەیە کە کاتێك دەستت بۆ ئاسمان بەرزدەکەیتەوە بۆ لای خودای پەروەردگار، پێویستە باوەڕت زۆر پتەو بێت کە پاڕانەوەکانتو نزاکانت قبووڵ دەبێت. دوا وتەم بە بڕواوە بژی، بە هیواوە بژی، بە ئامانجەوە بژی!



# حیکایەتێك کە هەرگیز کۆتایی نەیەت

و: گۆران جەمیل

دەگێڕنـــەوە کـــە پاشـایەك هەبـــوو، زۆر ئـــارەزووی لە گوێگرتـــن لە چیرۆكو بەســـەرهات بوو، هەر لەو کاتەوەی کە لە خەو هەڵدەســـتا تا پێش نووستن، چیرۆك گێـــڕەوەکان بـــە کۆمەڵ دەهاتـــن بۆ لای، بە ڕۆژو شـــەو، بـــەڵام هیـــچ چیرۆکێکی بـــە دڵ نەبـــوو، لەبەرئـــەوەی پێی وا بوو چیرۆکەکانیان کورتـــو زوو تەواو دەبن. ڕۆژێکیان بانگـــەوازی بڵاوکردەوە کە هەر کەس بتوانێت حیکایەتێکی بۆ بگێڕێتەوە کـــە کۆتایی نەیەت، ئـــەوە خەڵاتێکی زۆر باشو گرانبەهای دەکات.

بەڵام بە مەرجێك کە بێ کۆتایی بێت، ئەگەرنـــا ئـــەوە بەنـــدی دەکات. لەو ڕۆژە بـــە دواوە بەندیخانەکانـــی جمەی دەهات لە خەڵکـــی، چونکە کەس توانـــای نەبوو حیکایەتێك بگێڕێتەوە کە کۆتایی نەیەت.

بـــەڵام ڕۆژێکیان منداڵێك هات بۆ لای پاشاو خۆی پێ ناساندو وتی:

جەنابـــی پاشـــا مـــن حیکایەتێکت بۆ دەگێڕمـــەوە کـــە کۆتایی نەیەت! پاشـــا لە وەڵامدا وتی: ئەگەر ڕاستت کرد ئەوە بڕێکی زۆر زێڕو خەڵاتت دەدەمێ، بەڵام ئەگەر وا نەبـــوو، ئەوە وەکو ئەوانـــی دیکە دەچیتە بەندیخانە. منداڵەکە وتی: دەزانم.

پاشـــان منداڵەکـــە دەســـتی کـــرد بە کۆکینو چاوەڕێی کرد هەتا هەموو بێدەنگ بوونو هیچ دەنگێك نەما، دەســـتیکرد بە گێڕانەوەی حیکایەتەکەیو وتی: دەگێڕنەوە کە پاشـــایەك هەبوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، بەشێوەیەك کە توانای ژماردنی سامانەکەی نەبوو، ســـاڵێك لـــە ســـاڵەکان بەروبوومی برنجـــی هێندە زۆر بوو، لـــە پاش ئەوەی کە هەموو عەمارەکانیان پڕ کرد لە برنـج، هێشـــتا بڕێکی زۆر برنـج بەدەرەوە مابوو، هەر بۆیە پاشـــا فەرمانیدا کە عەمارێکی زۆر گەورە دروست بکەن! بە شێوەیەك کە بنمیچەکەی بگاتە نزیکی هەورەکان!!

لـــە پـــاش دروســـتکردنی عەممارەکە، جوتیـــارەکان برنجەکانیـــان هێنـــا بۆ ئەم عەمارە زەبەلاحە، دوای ئەوەی پڕیان کرد دەرگاکانیان داخست.

بەڵام شـــتێکی ســـەیر ڕوویدا، لە بنی عەمارەکـــەوە کونێکـــی زۆر بچووکـــی لێ بوو، مێرولـــەکان هەر زۆر ئـــەم کونەیان دۆزییـــەوە، دەســـتیان کرد بـــە دەرکردنی برنـــج، مێرولـــەی یەکـــەم هـــاتو دەنکە برنجێکـــی بردو چـــووە دەرەوە، مێرولەی دووەم هـــاتو دەنکە برنجێکی بردو چووە دەرەوە، مێرولـــەی ســـێیەم هـــاتو دەنکە برنجێکی بردو چـــووە دەرەوە، مێرووولەی چوارەم هاتو. . .

پاشـــا لە دوای ئەوەی کە ئارامی نەما وتی: پاشان چی؟

منداڵەکە وتـــی: دەبێ چاوەڕوان بیت، هەتا مێروولەکان هەموو برنجەکە دەبەنو هیچ لە عەمارەکە نامێنێت! پاشـــا هاواری کـــرد: ئەمـــە کـــەی ڕوودەدات؟ منداڵەکە: نازانم، ڕەنگە پاش ســـاڵێك، دەســـاڵ، یان هەتا ســـەد ســـاڵ بخایەنێت. پاشا هاواری کـــرد: من پیـــر بوومو هەتا ئـــەو کات بە زیندویی نامێنم.

منداڵ: دان بەخۆتدا بگرە، تۆ ئارەزووی ئـــەوە دەکەیت کە گوێت لە چیرۆکێك بێت کە هەر گیـــز کۆتایی نەیـــەت.. کەوابوو با بەردەوام بین، لە پاش مێروولەی سێیەم هی چـــوارەم هاتو دەنکە برنجێکی بردو چووە دەرەوە، مێروولـــەی پێنجەم هـــاتو دەنکە برنجێکـــی بردو چـــووە دەرەوە، لە پڕێکدا پاشـــا توڕە بوو وتی: باشـــە تـــۆ گرەوەکەت بردەوە، خەڵاتەکەت بەدەستهێنا!

سەرچاوە: حکایات قبل النوم





ئا: خوناو محەممەد

# بە فیڕۆنەدانی ئاو

*بۆچـــی پێویســـتە ئـــاو بەفیـــڕۆ نەدەین؟

- لە پێناو پاراستنی ئەم بەخششەی خوای گەورە بۆ خۆمـــانو نەوەکانی دوای ئێمـــە، چونکە ئاو ســـەرچاوەی ئاوەدانیو ژیانە.

- بۆ دوورکەوتنەوە لە زیادەڕۆیی کەوا لە هەموو ئاینەکان بە نادروست دانراوە؟

چۆن ئاو بپارێزین؟

-لە کاتی خۆشووشتندا (بانیو) پڕ ئاو مەکـــە، بەڵکـــو (دوش) بەکاربهێنە. ئەگەر پێویستیش بوو نیوەی (بانیو)ەکە پڕ بکە.

-کاتێك لە خۆشووشـــتن تەواو دەبیت، بەلوعەکان بە باشی بگردوە.

-لە کاتی شووشتنی دەموچاو، یان ددان شووشـــتن، بەلوعەی ئاوەکە بـــە کراوەیی بەجێ مەهێڵە.

-لە کاتی شووشـــتنی ددانەکان ئەگەر پەرداخی ئاو بەکاربهێنیت، ئاوەکە کەمتر سەرف دەبێت.

-ئەگەر زانیـــت بەلوعەیەك تێکچووە، ئـــەواماڵەوە ئـــاگادار بکـــەوە تاکو چاکی بکەنەوە.

-تەنهـــا ئەو بـــڕە ئاوە بـــەکار بهێنە کـــە پێویســـتتە بـــۆ خواردنـــەوە، یان بۆ ئامادەکرنی شەربەت بەبێ زیادەڕۆیی.

-لـــە ئاودانـــی باخچـــەدا (ئاوپڕژێن) بەکاربهێنـــە، لە جیاتی (ســـۆندە)، چونکە ئاوەکە کەمتر بە فیڕۆدەڕوات.

-شەقام بە ئاو مەڕشێنە.

-هیچ شتێك (با بچووکیش بێت) فڕێ مەدە ناو ڕووبارەکان.

-ئەگەر لـــە دەرەوەدا بینیت بۆرییەك شـــکاوەو ئـــاوی لێدەچێـــت، ئـــەوا لایەنی پەیوەندیدار ئاگاداربکەرەوە.

سەرچاوە/ سایتی البذرة کوم

وەهاب حەسیب



# بێکاری

**واتای بێکاری:** بێکاری دیاردەیەکە کاتێك ڕوودەدات کە کەسەکان کاریان دەستنەکەوێت، بە شێوەیەکی سروشتی بێکاری بە ڕێژەی بێکاری دەستنیشان دەکرێتو ناسێندراوە بە هێزی کاری ناکارا.

**کەسی بێکار:** کەسێکە تواناو ئارەزووی کارکردنی هەیە، بەکرێیەکی باو، بەڵام کاری دەستناکەوێتو بە بێکار دێتە ئەژمار.

**هێزی کار:** بریتییە لە کارکەرانو بێکاران، ئەوانەی ئارەزوو توانای کارکردنیان هەیە بە کرێیەکی باو، بەڵام کاریان دەستیان ناکەوێت.

**پێناسەی بێکاری:** بێکار ئەو کەسەیە لە سەرووی تەمەنێکی دیاریکراوەوەیە، توانای کارکردنی هەیەو بە دوای کاردا دەگەڕێت، بەڵام کاری دەستناکەوێت.

لەم پێناسەیەوە دەگەینە ئەم ئەنجامانە:

کرێکارانی ناوخۆن لە دۆخێکی بێکاری ڕاستەقینەدانو بێهیوابوون ئەوەندە گەڕان بە شوێنکارداو ژمارەیان زۆرە بە تایبەت لە خولی بێبازاڕیدا.

- کەسانێکن کاردەکەن، بەڵام لە کاتی سەرژمێریدا بە بێکار حسابیان بۆ کراوە، بە هۆی هۆکارێکی کاتییەوە بێکاربوون وەك نەخۆشی.

- کەسانێکن زیادە کارێکی ناجێگیر دەکەنو داهاتێکی نزمیان هەیە لەسەر حسابی خۆیان کاردەکەن، منداڵن، پەککەوتەکان، بە ساڵاچووان، ئەوانەی خانەنشین کراون.

- کەسانێکن توانای کارکردنیان هەیەو کار ناکەن، وەك قوتابیان مەبەستیانە گەشە بە لێهاتوویی خۆیان بدەن.

- کەسانێکی خاوەن دارایی‌و سامانو توانای کارکردنیان هەیە، بەڵام بە شوێن کاردا ناگەڕێن.

- کەسانێکی کارکەرن بە داهاتێکی دیاریکراو، هەمیشە بە دوای کاری باشتردا دەگەڕێن.

**بێکاری وەك دیاردەیەکی مێژوویی:** مێژووی بێکاری لەگەڵ مێژووی پیشەسازیدا دروست بوو، پێشتر لە ناوچە گوندنشینەکاندا بێکاری هیچ واتایەکی نەبوو، سەرەڕای بێکارییەکی ڕووپۆشکراو، بێکاری وەك دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لە کاتی شۆڕشی پیشەسازیدا لە سێیەکی کۆتایی چەرخی هەژدەیەمدا لە بەریتانیا دەرکەوت، دواتر لە وڵاتانی ئەوروپاو ئەمریکادا بڵاوبووەوە، شۆڕشی پیشەسازی گۆڕانێکی بنەڕەتی بوو لە شێوازەکانی بەرهەمهێنانداو لەو مێژووەوە سوپای بێکار دەرکەوتن لە کۆمەڵگادا.

کاریگەری ئامێر بەر لە هەر چینو توێژێك پیشەکارانو دەستڕەنگینانو کرێکارانێك کە کاری ماڵانیان ڕادەپەڕاند گرتەوە، ئەو کەسانە بە شێوەیەکی هێواشو لەسەرخۆ کارو شوێنی کارەکانیان لە دەستدا، لە ژێر کاریگەری دامەزراوە بە تواناکاندا، بێسەرچاوە مانەوەو بوون بە کرێکاری کارگەکان، یاخود لە کۆتاییدا بوون بە بەشێك لە سوپای بێکاران.

**هۆکارەکانی بێکاری:** ئامارەکانی حکوومەت بێکاری بۆ کۆمەڵێك هۆکار دەگەڕێنێتەوە، بریتین لە:

١- زۆربوونی ژمارەی دانیشتووان، بەشێوەیەك وڵاتانی تازە پێگەیشتوو لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا ژمارەیان دوو تا سێ بەرانبەر زیادی کردووە، بۆ نموونە لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا وڵاتی میسر سێبەرانبەر زیادی کردووە، ژمارەیەکی زۆری ئەو ڕێژەیە تەمەنیان لە نزیکی ٣٥ ساڵیدایە، ئەمەش دەبێتە هۆی زۆری دەستی کارو خواستی کار.

٢- گواستنەوەی سیستەمی ئابووری بۆ ئابووری ئازادو دەستبەرداربوونی دەوڵەت لە دامەزراندنی دەرچووانی کۆلێژو پەیمانگاکان، یان دەرچواندنیان بە ئاستێکی زانستی نزم، کە لە توانایاندا نەبێت لەگەڵ گیانو پێداویستی سەردەمدا خۆبگونجێنن.

**جۆرەکانی بێکاری:** جۆرەکانی بێکاری زۆرن بە پێی سیستەمی ڕامیاری‌و ئابووری گۆڕانیان بەسەردا دێت، سەرباریی ژینگەو تێڕوانینی مرۆڤەکان سەبارەت بە ژیانو چۆنێتی کارکردن، گرنگترینیان بریتین لە:

**١- بێکاری بەرکەوتە (بەریەککەوتن):** بریتییە لە هاتووچۆی بەردەوامی کرێکاران لە نێوان ناوچەو پیشە جیاوازەکاندا لە ئەنجامی گۆڕانکاری لە ئابووری نیشتیمانیدا درووست دەبێت، ئەمەش کاتێك ڕوودەدات کارکەرانی ناوچەیەك، یاخود هەرێمێك کۆچ بکەن بۆ ناوچەیەك، یاخود هەرێمێکی دیکە، یان ئافرەتی ماڵەوە بڕیاربدات منداڵەکانی بەجێبهێڵێت، (بەتایبەت پاش

گەورەبوونیان) بێتە دەرەوە بۆ کارکردن، هۆکارەکەشی ئەنجامی کەمی زانیاری تەواوە لە لایەن توێژەرانەوە دەربارەی کارو هەلی کارکردن، یان بە هۆی زۆریی ماوەی لێکۆڵینەوە دەربارەی کارو هەلی کارکردن.

**٢- بێکاری پەیکەری:** ئەم جۆرەی بێکاری تایبەتە بە بەشێکی دیاریکراو، کورت دەبێتەوە لەسەر کەرتێکی تایبەتی بەرهەمهێن، یاخود پیشەسازیی. لەوانەیە ئەم جۆرەی بێکارییە لە ناوچەیەکی فراوانو جیاوازیی هەرێمی وڵاتێکدا بڵاوبێتەوە، ئەم جۆرە لە بێکاری لە ئەنجامی گواستنەوەی پەیکەری ئابووریی وڵات، یان دۆزینەوەی سەرچاوەی سروشتی تازە، یاخود بەکارهێنانی هۆکاری تازەو لێهاتوویی بەرهەمهێنانو جێگرتنەوەی شمەکی نوێیە لە بری شمەکی کۆن.

**٣- بێکاری وەرزی، یان خولی:** ئەم جۆرەی بێکاری کاتێك دەردەکەوێت لە ئەنجامی وەستانی کەرتی کرێکارانو نەبوونی خواستی گشتی لەسەر کار. سەرهەڵدانی بەمجۆرە ڕاڤە دەکرێت نەبوونی توانای گشتی لەسەر کڕین، یاخود فرۆشتن، ئەمەش دەبێتە هۆی داشکاندنەوە لە ئابووریدا.

بێکاری وەرزی بەراورد دەکرێت بە جیاوازی ژمارەی ڕاستەقینەی کرێکارانو ژمارەی چاوەڕوانکراوی کرێکاران لە ئاستی بەرهەمهێناندا.

**٤- بێکاری ئارەزوومەندانەو بێکاری زۆرەملێ:** بێکاری ئارەزوو مەندانە ئەو جۆرە بێکارییەیە کە کەسی کارکەر بە ئارەزووی خۆی واز لە کارەکەی دەهێنێت، بە هۆی هۆکارێکی دیاریکراوەوە، هەرچی بێکاری زۆرە ملێیە ئەو دۆخەیە کارکەری تیادا ناچاردەکرێت واز لە کارەکەی بهێنێت، دوور لە ویستو ئارەزووی خۆی، لە کاتێکدا کە تواناو ئارەزووی کارکردنی هەیە بە کرێیەکی باو.

**٥- بێکاری ڕووپۆشکراو:** ئەم جۆرەی بێکاری کاتێك دەردەکەوێت، ژمارەی کارکەران زۆرتربێت لە ژمارەی سروشتی، بە واتایەکی دیکە ئەو ژمارە زیادەی کرێکاران هیچ شتێك بەرهەمناهێنن جێگای دیار بێتو ئەگەر ئەو ژمارەیە لە شوێنی کارکردن دەربهێنرێن قەبارەی بەرهەمهێنان کەم ناکات.

**٦- بێکاری سروشتی:** بێکاری سروشتی هەردوو جۆری بێکاری بەریەککەوتنەو بێکاری پەیکەری لە خۆ دەگرێت لە ئاستی تەواوی کارکەراندا، لەم دۆخەدا ژمارەی هەلی کار یەکسانە بە ژمارەی خواستی کار، بەڵام بێکاران لە جۆری بەریەککەوتەو پەیکەریدا پێویستیان بە ماوەیەك هەیە تا هەلی کارکردنیان بۆ دەرەخسێت. کاتێك ئابووری نیشتیمانی دامەزراندنی گشتی لە خۆ ناگرێت ئەو کات ژمارەی بێکاری باو زۆرتر دەبێت لە ژمارەی سروشتی، بەڵام کاتێك ئابووری نیشتیمانی لە دۆخی بوژانەوەدا بێت ئەو کات دۆخەکە پێچەوانە دەبێت.

**کاریگەرییەکانی بێکاری:** بێکاری کۆمەڵێك کاریگەری نەرێنی لەسەر تاکی بێکارو کۆمەڵگا دروست دەکات، بەم شێوەیە:

١- دواکەوتن لە پێکەوەنانی خێزاندا کە کۆمەڵگا ڕووبەڕووی کێشەیەکی توندتر دەکاتەوە، ئەمەش کاریگەرییەکی خراپ لەسەر ئاکاری تاك دروست دەکات، کە بەشێوەیەکی ترسناك هەستی پێدەکرێت لە بڵاوبوونەوەی جۆرەها شێوەی (زواجی عرفی)، کە لە وڵاتانی کەنداودا باوە، کە جۆرێکە لە داوێن پیسی، چونکە هیچ پەیوەندییەکی بە ئاینو بەرپرسیارێتیو پێکەوەنانی ماڵو خێزانەوە نییە، سەرەڕای جۆرەها شێوازی لە باربردنی منداڵو...

٢- لە ئەنجامەکانی بێکاری، پەنا بردنی زۆرێك کەسانی بێکارە بۆ بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، یان هۆکارەکانی سەرگەرمکردن، لە زۆرکاتدا پارەی پێویستیان نابێت بۆ دابینکردنی ئارەزووەکانیان، ناچار پەنا بۆ چەندین کاری هەڵە دەبەن بۆ دابینکردنی حەزو ئارەزووەکانیان.

٣- ئەم هەستی پەراوێزخستنو تێکشکاندنە، لەسەر کۆمەڵگاو دەوڵەت دەکەوێت، کە برێك لە گەنجانی نائومێد والێدەکات لە لایەن هەندێك دامەزراوەو ڕێکخراوەکانەوە، بەکاربهێنرێن دژ بە ڕژێمو دەوڵەت، ئەو دامەزراوەو ڕێکخراوانە لە هەوڵی دروستکردنی پەرچەکرداردا دەبن، لای ئەو گەنجانە لە ڕێگای وروژاندنی هەستو سۆزیانەوە.

٤- لە ئەنجامەکانی بێکاری، بیرکردنەوەی زۆرێك لاوانە لە کۆچکردن بە دوای نانو ژیاندا، بێئەوەی بزانێت لە ئەنجامی ئەم کۆچەوە چی چاوەڕوانی دەکات؟ لە کۆتاییدا هەندێکیان دەبن بە نێچیری دەڵاڵەکانی کۆچ پێکەرانی نایاسایی.

**چارەسەری بێکاری:** دوو تێڕوانین هەیە بۆ چارەسەری بێکاری، یەکەمیان ڕزگاربوون لە بێکاری بە پێویست دەزانێت کە بیروبۆچوونی ئابووریناسانی سەرمایەداریو هەڵقوڵاوی جیهانگیرییە بەم شێوەیە:

١- کەمکردنەوەی تێچوونی کار، واتا کەمکردنەوەی کرێ بە شێوەیەك تێچوونی بەرهەمهێنان کەمبکرێتەوەو بەرهەمهێنان بەشێوەیەك بەرزبکرێتەوە توانای کێبەرکێو بەدەستهێنانی قازانجی هەبێت.

٢- گۆڕانکاری لەمەرجەکانی بازاڕی کارداو کەمکردنەوەی باجو پانتایی کۆمەڵایەتیو قەرەبووکردنەوەی بێکاریو کەمکردنەوەی کاتژمێرەکانی کارکردن (گونجاندن لە کرێو کاتژمێری کارکردندا).

هەرچی بۆچوونی دووەمە دەرچوون لە کێشەی بێکاری بە پێویست دەزانێت بەم شێوەیە:

١- پێویستە دەوڵەت دەست وەربداتە کێشە ئابوورییەکانەوە بە مەبەستی دەستبەسەراگرتنی پشێوی ئابووریو هاوسەنگ ڕاگرتنی کۆمەڵایەتی.

بەڵام چارەسەری بنەڕەتی کێشەی بێکاری، پێویستی بە دووبارە بنیاتنانەوەی پەیکەری ئابوورییە لەسەر بنەمای خاوەندارێتی کۆمەڵ بۆ هۆکارەکانی بەرهەمهێنانو دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکانی مرۆڤەکان، دوور لە چوارچێوەی سەرمایەداری، واتا بنیاتنانی کۆمەڵگایەك کە سەرکەوتنو خۆشگوزەرانی بۆ کۆمەڵێکی کەم بێت لەسەر حسابی شکستو ژێرکەوتنی زۆرینەیەك کە لە توانایدا نەبێت ژیانێکی سەربەستانە بۆ خۆییو خانەوادەکەی دابینبکات.

٢- ڕاهێنانو ئامادەکردنی لێکۆڵەرەوان لە بوارە جیاوازەکانی کاردا، وەك دارتاشیو ئاسنگەریو ڕاوە ماسی... پرۆژە نیشتمانییە گرنگەکان، تا دواتر لە توانادا هەبێت لە دامەزراوە تایبەتو گشتییەکاندا وەربگیرێنو کاربکەن، بەڵام هەرچی ڕەگەزی ئافرەتانە پێویستە ڕاهێنانیان پێبکرێت لەو ڕێکخراوانەی تایبەتن بە ئافرەتاندا، تا لە توانادا بێت خێزانێکی بەرهەمهێن پێکبهێنرێتو هەموو ماڵێك پیشەی ئافرەتانی تیادا بێت، وەك بەرگدروییو پرۆژەی بچووك کە مایەی ڕەزامەندی ئافرەتانن تا ئەو کاتەی شوو دەکات، یان وەك مامۆستا، پۆلیس، نووسەر... هتد، دەستبەکار دەبێت.

٢- پێویستە لەسەر دەوڵەت بە شوێن بازاڕی ناوخۆو جیهانیدا بگەڕێت، بە مەبەستی بازاڕکاریو ساغکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی گەنجانو خێزانە بەرهەمهێنەکان بەرهەمی دەهێنن.

٣- پێویستە لەسەر دەوڵەت لە داهاتی وڵات برێکی کەم پارە دابینبکات بۆ منداڵانی کۆرپەو گەنجانی بێکار، کە ئەو ڕێژەیە یاسای نێو نەتەوەییو ئیسلامی بە شایانی ئەو گروپانەی دەزانن، لە کۆتاییدا حکومەت لە توانایدا دەبێت دەستبەسەر خاڵە نەرێنییەکانی بێکاریدا بگرێت.

ئا: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

# بەرەوپێشبردنی کارگێڕیو بەرەنگارییەکانی جیهانگیری



بەرەوپێشبردنی کارگێڕی و بەرەنگارییەکانی (جیهانگیریو ژینگەی دەرەوە)، ڕاگری پەیمانگای باڵا بۆ پەرەپێدانی کارگێڕی (م. د. محەممەد مەرعی) پڕۆژەی بەرەوپێشبردنی کارگێڕی لەسەر مامەڵەکردنی جوان لەگەڵ سێ بازنە، بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەوەستێت، بازنەی یەکەم بریتین لە دەستەی پڕۆژەکە کە پێویستە بە شێوەیەکی تەندروست هەڵبژێردرێنو لە بوارەکانی زانستیو پیشەییو ڕەفتاری ئامادەکراوبن. بازنەی دووەم بریتییە لەو دەزگایەی تیمەکە کاری تێدا دەکات، بە هەموو ناوەرۆکییەوە لە ڕۆشنبیری تایبەت بە خۆیو بونیادی ڕێکخستنو گروپەمرۆییەکانو کۆمەڵێك یاساو ڕێو شوێنو شێوازی سەرکردایەتی کارگێڕی.

ئەم بازنەیە وەکو فوتویەکی ڕەش وایە کە تیایداسەرجەم پێکهاتەکانی دامەزراوەکە بە میکانیزمێکی تایبەت بە خۆی چارەسەردەکرێت، بازنەی سێهەمیش ئەو ژینگەیە لە دەوروبەردایە ئینجا لەسەر ئاستی نیشتمانی بێت کە سیستمی سیاسیو ئابوریو فێرکردنو کۆمەڵایەتیو یاسادانانو تەکنەلۆژیاو دانیشتوانیو ژینگەیی نوێنەرایەتی دەکات، یان لەسەر ئاستی دەرەوە کە ڕێکەوتننامەکانو توانای ڕکابەرێتیو شوێنی جوگرافیو پێگەو توانای کێشکردنو شتی تر نوێنەرایەتی دەکات، ئەم سێ بازنەیە لەگەڵ یەکتری کارلێك دەکەن لە کاتی جێبەجێکردنی هەر پڕۆژەیەکی بەرەوپێشبردن، جا هەرچەند وزەو توانای تیمی کار لە بازنەی یەکەم بەرزبێت، ئەوا لەگەڵ سنورەکانی بازنەی دووەم دووچاری پێکدادان دەبێت، کە دامەزراوەکان دەگرێتەوەو ڕەنگە سەرکەوتنی پڕۆژەی خاوەن بازنەی یەکەم ئاسان بکات، یان کۆسپی بۆ دروست بکاتو شکستی پێ بێنێت، هەروەها لەگەڵ بازنەی سێهەمیش دووچاری پێکدادان دەبێت کە هەر دوو ژینگەی ناوخۆییو دەرەوە دەگرێتەوە بە هەموو قورساییو فشارو هەڵەکانیانەوە تا...

بێگومان باش بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ هەردوو بازنەی دووەمو سێیەم هەلی سەرکەوتن بۆ بازنەی یەکەم دەڕەخسێنێت، دواتر سەرکەوتنی پڕۆژەی بەرەوپێشبردنی کارگێڕی دێتەدیو خراپ بەڕێوەبردنی پەیوەندی لەگەڵ ئەم دووبازنەیە کۆسپو تەگەرەو لەمپەر دێنێتە کایەوە، بەڵکو بە تەواوی شکست دێنێت، -جیهانگیریی لە بازنەی سێیەم خۆی حەشارداوە، ئەمەش دیاردەیەکە خۆی سەپاندووە بەسەر هەموو وڵاتانی جیهان، وەکو واقیعێك کە ناکرێت دەربازبیت لە مامەڵەکردن لەگەڵیدا بە هەموو ئەو چاکیو خراپیانەی لە خۆی گرتووە، نابێت کاریگەری ئەم دیاردەیە فەرامۆش بکرێت، چونکە بڵاوبووەتەوەو زیادبوونی ژمارەی کۆمپانیا نێودەوڵەتییە فرەڕەگەزەکانو لقەکانیان لەسەرجەم وڵاتانی جیهان ئەم ڕاستییە دووپات دەکاتەوە، هەروەها قەبارەی فرۆشتنیان فراوانتربووەو بازرگانیو ژمارەی کارەکانیان پتربووە بەجۆرێك گەیشتۆتە پلەیەکی ئەوتۆ کۆمپانیامەزنەکان ژمارەی کارەکانیان لە بەرهەمی گشتی نیشتمانی زۆرێك لە وڵاتان زیاتربووە، هەروەها قازانجی ساڵانەیان بەشێوەیەك زیادی کردووە کە بەسەر ئەو بازرگانییە مەزنەی وڵاتانێك کەوتووە کە خاوەنی بازرگانییەکی گەورەو پڕقازانجن لەسەر ئاستی جیهان. دەستەواژەی جیهانگیریی لە دەساڵی ڕابردوودا مشتو مڕێکی زۆری نایەوە، چونکە ئاسۆیەکانی جارێ ڕوون نەببوونەوەو جیاوازییەك لە نێوان چەمكو جێبەجێکردن نەکرابوو لە مەیدانی کارداو ڕەهەندی سیاسیو ڕۆشنبیری جیهانگیریی بەشێوەیەکی نەرێنی وەرگیرا بوو، کە وای لە هەندێ وڵات کردبوو سووربوون لەسەر ڕۆشنبیریو سەروەری یان بە هۆشیاریو بە ئاگاییەوە ڕەفتار لەگەڵ جیهانگرییدا بکەن. بەم شێوەیە، پێناسەکانی چەمکی جیهانگیریی جیاوازبوونو لەوانەش: (ونبوونی جیهانی بەرتەسکی کار کە لە ڕابردوو باوبوو، بازاڕەکانی ناوخۆیی حوکمڕان بوون تیایدا، ئەمەش بە کاریگەری پەیوەندییە خێراو سیستمەکانی گواستنەوەکە وای لێهاتووە بازاڕێکی جیهانی بە تەنها تیایدا بەرجەستەبێت). یاخود (نەبوونی سنوورو بەربەست لەبەردەم بازرگانی لە نێوان نەتەوەکان لە ئەنجامی گواستنەوەو وەبەرهێنانو گواستنەوەی بەرهەمەکانو خزمەتگوزارییەکانو جموجۆڵی خاوەن تواناو لێهاتووییو عەقڵەجیاوازەکانو هێزەکارکەرەکانی تر کە کاری کردۆتە سەر بەرژەوەندییە بە یەکداچووەکان لە نێوان ئیشو کارو کۆمەڵگاکاندا).

پێناسەیەکی دیکەش هەیە، ئەویش: (فەلسەفەیەکی نوێیە پێویستی بە تەکنیکی هزریو هونەریو ڕەفتاری هەیە، بە پلەیەکی بەرزی گشتگیریو تەواوکاری کەوا پێویست دەکات وڵاتانو دامەزراوەو کۆمپانیا گەورەکان، بە یەکەوە گۆڕانکاری لە پەیامو ئامانجو ستراتیژو پلانی کارەکانیاندا بکەن، تاوەکو بتوانن ڕکابەرێتی بکەنو سەرکەوتن بەدەست بهێنن).

### ئەرێنیو نەرێنییەکانی جیهانگیریی:

جیهانگیریی چەند سیفەتێکی هەیە کە وڵاتانێك جێبەجێی دەکەن، کە دەچێتە ناو سیستەمەکەیانەوە لەوانەش:

ـ ڕەخساندنی ژینگەیەکی گونجاو بۆ بوژاندنەوەی چالاکییەکانی کەرتی تایبەتو ئابوری بازاڕ، بە لێهاتوویی ئەویش لە میانەی کارکردن لەسەر پتەوکردنی توانای هەناردەکردن بۆ ئابوری سەرکەوتوو ئامادە بۆ ڕکابەریو دەستخستنی چوونە ناوبازاڕی نێودەوڵەتییەوە.

ـ زیادبوونی تێکڕاکانی ئاڵوگۆڕی بازرگانی جیهانی کەوا هەلودەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ گەشەکردنو هاریکاریو ئینجا بەرزکردنەوەی ئاستی گەشەی وڵاتانو گوزەرانی دانیشتووانەکانیان.

ـ بەرجەستەبوونی بەهاوچەمکی تازە کە پاڵنەری دەستپێشخەری تاکو هاندەری داهێنانەو پەسەندکردنی ڕاوبۆچوونەکانو وازهێنان لە کاری لاسایی کردنەوە.

- هاندانی وڵاتان لەسەر دووبارە ڕێکخستنەوەو چوارچێوەی دامەزراوەی گشتیو تایبەتییەکان بە یەکەوە، بۆئەوەی دەرهاویشتەکانی داواکارییەکانی جیهانگیریی بینێتە دی.

- دۆزینەوەی ڕێگای تازە بۆ ئەم وڵاتانەی ئێستاو داهاتوویان وابەستەی شێوە ئابورییەکی دیاری کراویان بەرهەمو خزمەتگوزاری دیاریکراوە، هەروەها دەستەبەرکردنی ژینگەیەکی نوێی ئابوری کە یارمەتی بدات بۆ چاوخشاندنەوە بە دابەشبوونی کۆمەڵایەتی هاتنەوەو بەرزکردنەوەی ئاستەکانی ژیانو گوزەرانی ئەو چینو توێژانەی هەژارو کەمدەرامەتن.

بێگومان جیهانگەرایی لایەنی خراپیشی هەیە، پێویستەدرکیان پێ بکرێو ڕووبەڕوویان ببنەوە لەوانەش:

- کاڵبوونەوەی ڕۆڵی دەوڵەتو ونبوونی هەندێك لە یادە سەروەرییە نیشتمانییەکان.

- زۆربوونی حاڵەتەکانی پەراوێزخستنی هەندێك لە چینەکۆمەڵایەتییەکان کە زانستو شارەزاییان کەمترەو دوورخستنەوەیان لە کەڵك وەرگرتن لە دەستکەوتو دەرهاویشتەکانی گرانەوەو باشترکردنی ئاستی بژێوی.

- تەشەنەکردنی بێکاریو حاڵەتەکانی هەژاری لە ناوەندی کەسانێك کە کەمتر شارەزاو لێزانن.

### بەرەوپێشبردنی کارگێڕی لە ڕووبەڕووبوونەوەی جیهانگیریی:

ئەو نەرێنییانەی لەگەڵ جیهانگیریی سەپێنراو دێنە ئاراوە، وەکو تەوژمێکی ئابوری جیهانی چەندین دەردراوی ترسناك لەخۆ دەگرن، کە ناتوانرێت بەرەنگاریان ببنەوە، تەنها بە بوونی داهاتی مرۆیی نەبێت کە خاوەن توانای داهێنانی گەورەیان هەیەو زۆرشارەزاو لێهاتوون لە مەیدانی کاردا، ئەمەش لەو نیشانانەدا دەردەکەوێت:

- بازاڕی ئیشو کار لە سایەی جیهانگەراییەوە داواکاری زیاترو زیاتر بە خۆیەوە دەبینێت، بۆ هێزی کاری شارەزاو بە تواناو پسپۆڕ کە لە توانایدایە کارو ئەرکی ئاڵۆزو پێشکەوتوو بەردەوام ئەنجام بدات، هەروەها نەبوونی سیفەتی هێزی کار لە هەر وڵاتێك هەلو دەرفەتەکانی کاری بازاڕسنووردار دەکات.

- جەختکردنی پێوەرەکانی توانای مرۆیی لە سایەی باشترین کارگێڕی گشتگیر لە سەر پێویستی پەرەپێدانی توانا مرۆییەکان لە ڕێگەی مەشقو فێرکردنی بەردەوام بۆ مامەڵەکردنی چاك لەگەڵ گۆڕانکارییە تازەکان لە ڕووی ڕێکخستنو تەکنەلۆژیاو زانستییەوە، بۆیە کەمتەرخەمی لە مەشقو فێرکردنی بەردەوام، توانای کارکردن کەم دەکاتەوەو سنووورداری دەکات بە گوێرەی پێوەرە جیهانییەکانی کار.

- نەبوونی سیفەتەکانی سەرمایەی فیکری لە دامەزراوەکانو هێنانەدی توانستەمرۆییەکان سنووردار دەکات، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ ئەستەم بوونی بەرەنگاربوونەوەی مەترسییەکانی جیهانگیریی.

- بەرەوپێشبردنی کارگێڕی لە دامو دەزگاکان توانای چنینەوەی ئەرێنییەکانی جیهانگیرییو خۆ دوورگرتن لە نەرێنییەکان دەگرێتەخۆ، ئەمەش پێویستی بە جیاکاری هەیە لە تەوەرەی چالاکییەکانی بەرەوپێشبردنی کارگێڕی، بەشێوەیەکی بنەڕەتیش لە بەڕێوەبردنێکی ڕێگەپێدراو کە پێویستە توانای داهێنانو نوێخوازیو ڕێکخستنی هەبێت.

بێگومان بەرەوپێشبردنی کارگێڕی ڕووبەڕووی ئاستەنگو مەترسییەکانی جیهانگیریی دەبێتەوە، بۆئەوەی ئەم بەرەوپێش بردنە شێوەیەکی سیستمی تەواوکاری وەرگرێت، پێویستە ڕوانگەی کارێکی ئەوتۆ لە خۆ بگرێت کە پێکهاتووە لە: (بەرەوپێشبردنی هزر، ئاگاداربوون لە گۆڕانکارییەکانو هەستکردن بە پێویستی زانیاریو شتەزانراوە خوازراوەکان، بەرەوپێشبردنی ڕێگاو ئامرازەکان، بەکارهێنانی بەرنامەڕێژی کارومەشقو ڕاهێنانی چالاكو وەبەرهێنانی پسپۆڕی بەردەست بۆ بەرژەوەندی دامودەزگاکان، بەرەوپێشبردنی تواناو لێهاتووییەکان، درککردن بە جیاوازییەکانی تاكو دیاریکردنی تواناو لێهاتوویی خوازراو بۆ پێشکەوتن، بەرەوپێشبردنی خود، هەست کردن بە بەرپرسیارێتی لە وەرگرتنی زانیاریو جێبەجێکردنی شتەزانراوەکان لە بەرژەوەندی دامو دەزگادا).

ئەگەر دامو دەزگاکان توانیان ئەو سیستەمەی سەرەوە بەڕێوە ببەن، ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانن پرۆژەی بەرەوپێشبردنی کارگێڕی ئەنجام بدەن.



# مرۆڤ و تواناو مەوداكانی بیركردنەوەی..

دیمەن حەیدەر

لای هەمووان ئاشكرایە بیركردنەوە تاكە تایبەتمەندی جیاكردنەوەی مرۆڤە لە درووستكراوەكانی تری سەر ڕووی زەوی، بە هۆیەوە ڕێزو كەرامەتو شكۆو گەورەیی پێبەخشراوە.

ڕەنگە زۆرێك لە ئێوە تا ئێستا چەندین جار ئەو پرسیارە بە مێشكتاندا هاتبێت، كە ئایا خولقاندنی تواناو لێهاتووییەكانی بیركردنەوەی مرۆڤ لە یەك ئاستدایە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ، بە شێوەیەكی گشتیو لە بنەڕەتدا لە یەك ئاستدا دروستكراوە، بەڵام ئەوەی دەیگۆڕێت چۆنییەتی بەكارهێنانو شێوەو ئاستی پەرەپێدانییەتی، بەڵكو ڕادەو ئاستی بەكارهێنانی ئەو توانایەی پێیان بەخشراوە لە دەست مرۆڤەكان خۆیاندایە..

ڕەنگە بڵێیت وانییە، چونكە مرۆڤی لای ئێمە لە داهێنانو زانستەكانی سەردەمدا، زۆر لە ئاستێكی نزمتر لە ئاستی وڵاتانی پێشكەوتوو، بە تایبەت ڕۆژئاوادان، لە وەڵامدا دەڵێین: بەڵێ لە وڵاتی ئێمەدا داهێنەر كەمن، چونكە هەوڵ نادەنو نایانەوێت داهێنەر بن، یان بوارو ڕێگە خۆشكەرو ژینگەی لەباریان نەبووە بۆ داهێنان لە هەموو بوارەكان، خۆ مرۆڤی ڕۆژئاوایی بە داهێنەری لە دایك نەبوون، ئەوانیش لە ئەنجامی تێڕامانو بەكارهێنانی ئەو جەستەیەی پێی بەخشراوە، ڕەخساندنی هەلی لەبارو گونجاو بۆ داهێنان، گەیشتۆتە ئەو ئاستەی كە تێیدایە.

بەڵكو ئەگەر بەراوردێكی ڕاستەقینە لە نێوان ئێمەو ئەواندا بكەین، ئەوا مرۆڤەكانی لای ئێمە بە تواناترو بە مانایەكی تر بیر كامڵترو ئاقڵترو زیرەكترن، چۆن؟ ئەوان هەموو داهێنانو پێشكەوتنەكانیان لە ژێر ناوێكدا كۆدەكەنەوە كە ئەویش (زانستی سەردەم)ە، ئەی ئەم زانستە لە كوێوە وەرگیرا؟ ئایا لە فەزایەكی دەرەوەی ئەم گەردوونەدا بیریان كردۆتەوەو داهێنانەكانیان پیشان داوە؟ بێگومان نەخێر، ئەوان بیرۆكەو داهێنانەكانیان كە لوتبەرزی كردوونو شانازی پێوە دەكەن، هەر لەو تەكنیكو هونەرانەوە وەرگرتووە كە زیندەوەرە بچووكەكانی سەر زەوی لە شێوازو بەڕێوەبردنی ژیانیان بەكاریان هێناوە، دەمێكە فێری كراون لە لایەن پەروەردگاریانەوە، هەر وەكو ڕاستییەكانی زانستی سەردەم دەیسەلمێنێتو دەریدەخات كە هەر لە بچوكترین داهێنانەكانیانەوە تا گەورەترینیان لە زیندەوەرە بچووكو جۆراوجۆرەكانی دیكەی سەررووی زەوییەوە وەرگرتووە، هەروەك دروستكردنی پێشی كەشتییەكان لە شێوەو ئەندازەی سەری دۆلفیندا بۆ ئاسانیو خێرایی لە ڕێكردنیاندا، یان دروستكردنی فڕۆكە لە شێوەو قەبارەی باڵندەكاندا، یان دروستكردنی چەندین كەرەستەی بەهێزو گوللەنەبڕ لە لاسایی كردنەوەی پێكهاتەكانی تەنافی جاڵجاڵۆكە، كە چەندان جۆرو بە شێوەیەكی ئەندازەیی زۆر ڕێكخراو هەڵدەستێت بە دروستكردنی، بە ڕادەیەك زاناكان سەریان لەو هەموو وردەكاریانەی تیایدا بەكاری دەهێنێت سوڕماوە؟ ئەی ئایا كێ فێری گیانەوەرێكی بچووكی وەكو جاڵجاڵۆكەی كرد، وەها ماددەیەك دروست بكات لە پێناو درێژەدان بە ژیانی؟ كە ئێستا ئەو پێكهاتەیە لە دروستكردنی قایشی بەستنەوەو سەلامەتی ناو ئۆتۆمبێلدا بەكار دەهێنرێتو چەندین پێداویستی تر كە لێرەدا بواری باسكردنیانمان نییە.

بە هەرحاڵ مەبەستمان لەوە نییە لە نرخی كاری داهێنانو داهێنانكاری كەم بكەینەوە، بەڵكو هەركارێك لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بەكار بهێنرێت نرخو بەهای خۆی هەیە، بەڵام لێرەدا مەبەستمان لەوەیە كە جیاوازییەك بكەین لە نێوان توانای بیركردنەوە لەگەڵ مەودای بیركردنەوەدا، ئەوان ئەوپەڕی توانای بیركردنەوەیان بەكارهێناوەو هێزو توانایان وەگەڕخستووە، بەڵام مەودای بیركردنەوەكانیان سنوردارو تەسكەو لە چوارچێوەی سنوری بینیندا دەمێنێتەوەو لەوە زیاتر بڕ ناكات، بەڵام مرۆڤی لای ئێمە، یان بڵێین: مرۆڤی خاوەن ڕێبازو یاسای خوایی مەودای بیركردنەوەكانی فراوانەو دەچێتە ئەودیو سنوری بینینەوەو بۆ جیهانی دەرەوەی ماددەو ماددەگەری مل دەنێت، ئیدی ئەو كات بەهێزكردنو بەكارهێنانی توانای بیركردنەوەو داهێنان لە چوارچێوەی سنوری بینیندا بۆ ئەم قۆناغێكی زۆر ئاسانتر دەبێت. لەبەرئەوەی قۆناغە بنەڕەتییەكەیان كە باوەڕبوونە بە بوونی خواو ئەوانەی لە توانای بینینی ئێمەدا نین بڕیووە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە بناغەو بنچینەی تواناكانیان دارشتووە، بەڵام ئەوان بناغەیان نییەو یەكسەر دەستیان بە درووستكردنی دیوارەكە كردووە كە لە هەر كاتو ساتێكدا بێت ئەگەری ڕووخانو دارمانی لە ناكاوی بەسەریاندا هەیە.

ڕەنگە لێرەدا پرسارێكی تر بێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە كە ئەوان ڕێبازی خواییان پێ نەگەیشتووە، ئیتر چۆن چۆنی بەو شێوەیە بڕیاریان بە سەردا بدەین؟ بەڵام خودای باڵادەستو دروستكاری بوونەوەر، خۆی بە دانایی خۆی لە كاتی دروستكرنی مرۆڤدا حسابی بۆ ئەوانەش كردووە، ئەویش بەوەی سروشتو حەقیقەتیانی وا دروستكردووە كە ئەگەر لە ناو ڕێبازو بانگەوازەكەشی نەبنو لێی دووربن نەفسو دەروونی مرۆڤ هەمیشە بە دوای دۆزینەوەی حەقو حەقیقەتدا وێڵە، مرۆڤ لە هەر شوێنێكی دوورە دەستی ئەم دونیایەدا غەریزەی گەڕان بە دوای ڕاسترینو گونجاوترین بەرنامەدا كە لەگەڵ سروشتی خۆی بسازێت پێ بەخشراوە، ئیدی قبوڵكردن، یان نەكردنی ئەو حەقیقەتە، خراوەتە دەست خۆیو سەرپشكە كامیان هەڵدەبژێرێت، ئایا خۆی لەو ئەركانە دەدزێتەوەو نایەوێت بچێتە ژێرباریانەوە، یان بێباكانەو بە تامەزرۆییەوە بە شوێنی دەكەوێتو تا كۆتایی ڕێگەكە بەردەوام دەبێت.

ئینجا لێرەدا كورتی مەودای بیركردنەوەی ڕۆژئاواییەكان لەوەدا زەقتر دەبێتەوە كە هەموو ئەو ڕێكو پێكی و سیستەمە ڕێكخراوەی لە دونیادا بەچاوی خۆیان دەیبینن تەنانەت دروستكردنی خۆشیان دەخەنە پاڵ ناوێكی وەهمیو گومان لێكراوو بێ گیانەوە، ئەویش (سروشت)ە، باشە ئەی سرووشت درووستكراوی كێیە؟ باشە ئەمە خۆ خەڵەتاندنو تەسكیو كەمووكوڕی نییە لە ئەقڵو بیركردنەوەدا؟ زانستو داهێنانێك كە خاوەنەكەی گومڕاو سەرلێشێواو بكات سوودی چییە؟ لە كاتێكدا هەموو بیركردنەوەكانیان لە سنوری چاو

(بینین) تێناپەڕێت، ئەی لایەنە مەعنەویو مرۆڤایەتییەکەی تر چی لێهات؟

لەم بارەیەوە مامۆستای ناودار (سەعیدی نورسی) لە نموونەیەکی جوانو ئاشکرادا جۆری بیرکردنەوەی ئەم مرۆڤانەمان بۆ ڕوون دەکاتەوەو تیایدا دەڵێت: جارێك مرۆڤێکی زۆر نەزان کە لەوەو پێش هیچ لایەنێکی شارستانێتی نەدیبوو، لە دەشتێکی چۆڵدا دەچێتە ناو کۆشکێکی جوانەوە، کە بەوپەڕی جوانکاری ڕازابووەوەو تازەترین ئامێری هۆو پێداویستی تێدا ئامادە کرابوو، کە دەچێتە ناویەوە بە وردی سەرنجی دەداتو تەماشای نەخشو نیگارو وردەکاریو جوانکاری ئەو کۆشکە دەکات، بەڵام نەزانیو کەم ئەقڵییەکەی وای لێکرد کە بڵێ: یەکێك لەم شتە جوانانەی ئەم کۆشکە، کۆشکەکەی دروستکردووە! چونکە لەم بیابانو دەورووبەرەدا هیچ کەسێك دیار نییە کە ئەوە بگەیەنێت دەستی بۆ بنیاتنانو ڕازاندنەوەی ئەم کۆشکە درێژ کردبێت، ئیتر بۆ دۆزینەوەی بنیاتنەری ئەم کۆشکە دەستیکرد بە گەڕانو پشکنین لە نێوان ئەو شتانەی کە لەناو کۆشکەکەدا بوون، چاوی بە ناویاندا گێڕا تا شتێك بدۆزێتەوە کە دروستکردنو ڕازاندنەوەو دابینکردنی ئەو کەرەستانەی لە توانادا بێت، بەڵام هەرچەندەش دنیا نەدیدە بوو، کەچی هەرچییەکی دەبینی نەدەچووە ئەقڵییەوە کە ئەو شتە بەدیهێنەری کۆشکەکە بێت، پاش ماوەیەك لە گەڕانو پشکنین دەفتەرێکی دۆزییەوە کە نەخشەی بنیاتنانو پێڕستی ناوەڕۆکو یاساکانی بەڕێوەبردنی ئەو کۆشکەی تیا نوسرابووەوە، هەرچەندە ئەو دەفتەرە لە ڕاستیدا وەکو هەموو ئەو شتانەی تیایدا نوسراوە بنیاتنانو ڕازاندنەوەی ئەو کۆشکەی لەباردا نییە، چونکە نە دەستی هەیە تا کاری پێ بکاتو نە چاویشی هەیە تا پێی ببینێت، هەرچەندە ئەمە حاڵی ئەو دەفتەرەیە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئەم کابرایە دڵی چووە سەر ئەو دەفتەرەو لای وابوو کە لە هەموو شتەکانی ناو کۆشك گونجاوترە بۆ ئەو مەبەستە، چونکە نەخشەی بیناو کەرەستەو ناوەرۆکی کۆشکەکەی تێدایەو زیاتر لەتەکیا گونجاوە، لەبەرئەوە ناچار بووە بڵێ: تەنها ئەم دەفتەرەیە کە ئەم کۆشکەی بنیاتناوەو ڕێکوپێکی کردووەو ڕازاندوویەتییەوەو شتەکانی ناویشی ڕێکوپێك کردووە، ئیتر بەم وتە بێ ماناو دوور لە ژیریانەوە، شەرعیەت بە بۆچوونەکەی خۆی دەدات، دیارە مەبەستی لەو کابرایە، ئەو مرۆڤە بێ ڕێبازانەن کە هەموو دروستکراوەکانی ئەم بونەوەرە بەو هەموو ڕێکو پێکییەوە دەدەنە پاڵ ناوی سروشتو کۆشکەکەش لە نموونەی ئەم کۆشکە گەورەیەی گەردوونەوە دێنێتەوە، کە ئاشکرایە ڕێکوپێکترو جوانترو پڕ لە وردەکاری ترەو جێگای بەراورد کردن لە نێوانیاندا نییە، بەڵام بۆ زیاتر بەرچاو ڕوونیو تێگەیشتنی خوێنەر ئەم نموونەیەی واهێناوە، دەفتەرەکەش لە نموونەی ئەو سرووشتەی کە درووستکراوەو ئەوان بە بێ ئاگاییەکی زۆرەوە بە دروستکەری دەزانن.

ئیدی ئەگەر ئەمە ئەقڵی گەورەی ئەو ڕۆژئاواییانە بێت، بە چ هەقێك ناوی زاناو بیرمەندیان لێ بنێین؟ دیارە مرۆڤی زاناو خاوەن ئەقڵ، مەودای بیرکردنەوە، بە تەنها لە تێڕامان لە ئاسمانو زەوی، گومانی لە بوونی خودا نامێنێت، بە ڕوونی لە بوونی زاتێکی باڵادەست بەسەر ئەم دونیایەدا دەدوێت.

لێرەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە شکۆداریو گەورەیی مرۆڤ لە بەرگریکردنو وتنی حەقو ڕاستییەکاندا دەردەکەوێت، لەوەدا دەردەکەوێت کە بێ ترسو سڵکردنەوە ڕاستییەکان بدرکێنێتو بەرگرییان لێ بکات، ئەمەیە هێماو سمبولی مرۆڤایەتییە بە مانا ڕاستەقینەو گەورەکەی. ئیدی دانانی پێوەرێکی دیکەی جیاو بەدەر لەمە بۆ گەورەیی مرۆڤ خۆ خەڵەتاندنەو چەواشەکردنی تاسەر ئێسقانی خودەو پشتکردنە لە ڕاستی، مرۆڤێك ئەگەر خاوەن هەموو لێهاتوویيەك بوو، بەڵام وەکو تووتی: گەورەو کاربەدەستەکەی هەرچی وت، ئەمیش دووبارەی بکاتەوەو ترس لە بەرژەوەندییەکانی ڕێی لە وتنو دەرخستنو بەرگریکردن لە ڕاستییەکانی لێ بگرێتو بەو ئاسانییە بەرچاوی خۆی لێڵو وێڵو تاریك بکاتو بە دەستی خۆی خۆڵ لە چاوی خۆی بکات، خۆی لە ڕیزی مرۆڤایەتی هێناوەتە خوارەوەو هەموو مافێك بۆ ڕێزلێگرتنی لەدەست دەدات. ئەو وەك چۆن بەرچاوی خۆی لێڵ کردووە، ئاواش دەیەوێت دەورووبەرەکەی لە ئاست ئەودا لێڵ بینو بیر تاریك بن، نەخێر مرۆڤی شکۆدار بە ئاسانی خۆی بەدەستەوە ناداتو چۆك بۆ هاوڕەگەزو هاوشانەکانی خۆی نادات، مرۆڤ ئەو کاتە مرۆڤە کە تەنها تەسلیمی خوای خوڵقێنەرو بەرنامەکەی بێت، نەك دیلی دەستی ئەمو ئەو، ئێمە خاوەنی بەرنامەیەکین کە تاسەر ئێسقان جێی شانازییە، ئەوە هەر خۆمانین کەمتەرخەمین لە بەڕاستیو بە ڕێکوپێکی پەیڕەوکردنی ڕێبازەکەمانو دواتریش زۆر نەزانانە تۆباڵی شکستو کەموکوڕییەکانمان دەخرێتە ئەستۆی ئەو، وەك بیانوویەك بۆ لە کەدارکردنی، ئێمە دەبێت دەست بە ڕێبازەکەمانەوە بگرین، نەك کلتوری ڕۆژئاوا هەرچییەکی پێ وتین، بێ ئەملاولاو بە ملکەچییەوە قبوڵی بکەین، دەبێت بۆیان بسەلمێنین کە نرخو بەرزیو شکۆداری مرۆڤ لای ئێمەیەو ئەوە ئێوەن کە ڕێگاکەتان هەڵە کردووەو هەتا ئێستاش قوربانی دەستی کێشەو ئازارەکانی ڕێگا هەڵەکەتانن، ئەوە ئێمەین دەبێت ئەوان بانگهێشتی سفرەو خوانی پاکژمان بکەین، نەك ئەوان بە ڕووکەشێکی بریقەداروو ناوەڕۆکێکی وێرانەوە بمانخەڵەتێنن.



درەخشان بەهادین

# باوەڕپێبوونو دڵنیاییو هیواداربوون

**باوەڕپێبوون: Confidence**

خەڵکی ئاواییەك بڕیاریاندا بۆ بارینی باران پێکەوە بپاڕێنەوەو نوێژە بارانە بکەن، ئەو ڕۆژەی کە تەواوی خەڵکەکە لە شوێنی دیاریکراودا بۆ نوێژە بارانە کۆبوونەوە، تەنها کوڕێکی مێرد منداڵ بە چەترەوە هاتبوو، ئەمە واتە باوەڕپێبوون.

**دڵنیایی: Certainty**

دەتوانین دڵنیایی بە هەستی منداڵێکی ساوای بچوێنین، کە کاتێك لە ئامێزی دەگرینو لە پڕ بۆ سەرەوەی هەڵدەدەین، ئەو پێدەکەنێت، دەزانیت بۆچی؟

لەبەرئەوەی دڵنیایە کە کەسێك دەیگرێتەوە، ئەمە واتە بڕواپێکردنو دڵنیایی.

**هیواداربوون: Hope**

ئێمە هەموو شەوێك لە سەر جێگە ڕادەکشێینو دەخەوین، بێئەوەی دڵنیابین کە ڕۆژی دواتر بە ئاگا دێینەوە. بەڵام هەمیشە بۆسبەینێی خۆمان بەرنامەو هیوامان هەیە، ئەمەش واتە هیوا.

کەواتە با بە باوەڕپێبوونو دڵنیاییو هیواوە بژین!

# هەموو کەس ئەرکی خۆی هەیە



نوسینی: C.J.Foster
و: ئیمان ناصح

دکتۆر مارلین هەر لە ساڵەکانی زانکۆیەوە یەکێك بوو لەوانەی هەمیشە وا بیری دەکردەوە کە ئەو کەسانەی نەخۆشی هەمیشەییو چارەسەر نەکراویان هەیە، یان کەمئەندامن لە ژیانیاندا دەبنە ئەرکو قورسایی بەسەر خۆیانو خێزانەکانیانەوە!

هەر کات کە لەگەڵ هاورێکانیدا قسەیان دەربارەی ئەو بابەتە دەکرد، پێداگری لەسەر بیرۆکەکەی خۆی دەکردو دەیویست بیری خۆی بسەپێنێت بەسەر کەسانی چواردەوریداو قەناعەتیان پێ بکات.

کاتێك هاورێکانی لێیان دەپرسی: باشە ئەرکی ئێمە چاودێریکردنو ئاگاداربوونی کەمئەندامانو شەلو نابیناکان نییە؟

وەڵامی دەدایەوەو دەیگوت: نەخێر، ئەرکی ئێمە چارەسەری نەخۆشەکانە، گەر نەخۆشێك چارەسەری نەبێت، دەتوانین چی بۆ بکەین؟

شەوێك دکتۆر مارلین رێی کەوتە گەرەکێکی هەژارنشین، تا یارمەتی ئافرەتێکی پەنابەری ئەڵمانی بدات کە کاتی مناڵبوونی بوو!

ئافرەتەکە دەیەم منداڵی تازە لە دایکبووی کەمئەندام بوو، قاچێکی لەوی دیکەیانی کورتتر بوو!

لە کاتێکدا هەناسەدانی منداڵەکە لاواز بوو، دکتۆر مارلین هەستا بە دانانی هەناسەی دەستکرد بۆ منداڵەکە!

لەو کاتەدا کە خەریکی یارمەتیدانی منداڵەکە بوو، بیرێك بە مێشکی دا هاتوچۆی دەکرد: ئەم منداڵە بۆ دەبێت بژی؟ لە تەواوی ژیانیدا بە کەمئەندامی دەمێنێتەوە، منداڵەکانی تر گاڵتەی پێ دەکەن، بۆچی دەبێت یارمەتی بدرێت تا بژی؟ دەتوانێ لە ژیانیدا سوود بە کێ بگەیەنێت؟

سەرەرای هەموو ئەم بیرکردنەوانەی کە بەمێشکیدا هاتوچۆیان دەکرد، دکتۆر مارلین یارمەتی منداڵەکەی دا، بۆئەوەی گرفتی تەندورستییەکەی چارەسەر بکات، هەر کە منداڵەکە دەستیکرد بە هەناسەدانی ئاسایی، خۆی خێرا جانتاکەی هەڵگرتو ماڵەکەی بەجێهێشت.

لە رێگادا بیری دەکردەوەو بە خۆی دەگوت: نازانم بۆچی ئەم منداڵەم رزگار کرد، خێزانەکەی هەژار بوو، زۆریش قەرەباڵغ بوون، باشە دەبێت لە ژیانیدا چ کارێکی پێبکرێت؟

چەند ساڵ تێپەری کرد، دکتۆر مارلین بەرەو شارێکی تر رۆشتو لەوێ دەرمانخانەو شوێنێکی تایبەتی بە پشکنینی نەخۆش کردەوە. لەو کاتانەی تەمەنیدا وازی لە بیرکردنەوەکانی سەردەمی گەنجی خۆی هێنا بوو.

هەمیشە کەسێکی ماندوو نەناس، بەیانی تا ئێوارە تەنها هەوڵی چارەسەرکردنی نەخۆشی دەدا، تەنانەت ئەو نەخۆشانەش کە بێ هیوا ببوونو تاکەچارەسەریان تەنها مردن بوو، هەموو کات هەوڵی رزگارکردنی ژیانی دەدان، ببووە دکتۆرێکی ماندوونەناسو دڵسۆزو بە ئەمەك بۆ نەخۆشەکان.

رۆژێك لە رووداوێکی هاتووچۆدا کورە تاقانەکەیو بووکەکەی گیانیان لە دەست دا، ئەوەی کە تەنها بە سەلامەتی دەرچوو کورەزاکەی دکتۆر مارلین بوو، کورەزاکەی کە بەبێ باوکو دایك مایەوە، چووە لای دکتۆرو ئەویش ئیدی لەو کاتەوە هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردبوو بۆ کورەزا تاقانەکەی.

لەو کاتەدا کە منداڵەکە رۆژانی تەمەنی ١٠ ساڵی بەرێ دەکرد، بەیانییەك چووە لای باپیریو پێی گوت: کە ئازارێکی زۆر ملو سنگو قاچو باڵەکانی داگرتووە!

سەرەتا دکتۆر مارلین بیری دەکردەوە کە کورەزاکەی تووشی نەخۆشی شەلەل بووبێت، بەڵام دوای پشکنین بۆی دەرکەوت

کە تووشی نەخۆشییەکی زۆر دەگمەن بووە، کە ئیلتیهابی ئێسکەکان بوو!

دکتۆر مارلین لە هەموو ئەو ساڵە دوورو درێژانەی کە دکتۆری کردبوو هیچ نەخۆشییەکی بەو شێوەیەی بەرچاو نەکەوتبوو، سەرەڕای ئەوەش لە کتێبە پزیشکییەکاندا زانیارییەکی تەواوو پێویست نەدرا بوو لەسەر ئەو جۆرە نەخۆشییە.

لە کۆتاییدا دەرکەوت ئەنجامی ئەم نەخۆشییە ئیفلیج بوونە، بەڵام هیچ کام لە پسپۆڕە لێهاتوو بەناوبانگەکان نەیاندەزانی کە ئاخۆ چارەسەری ئەم نەخۆشییە چییە!

ڕۆژێک دکتۆر مارلین لە یەکێک لە گۆڤارەکاندا ناوی دکتۆرێکی خوێندەوە دکتۆر ( پ.ژ.میللەر) کە دانیشتووی شارێکی بچووک بوو، ئەو دکتۆرە سەرکەوتنی لە چارەسەرکردنی زۆرێک لە هاوشێوەی ئەو نەخۆشییانەدا هێنا بوو.

دکتۆر مارلین کوڕەزاکەی برد بۆ ئەو نەخۆشخانە تایبەتەی کە دکتۆر میللەر تایبەت بە چارەسەری نەخۆشی ئیفلیجی کردبوویەوە، دکتۆر میللەر وەك زۆرێك لەو نەخۆشانەی کە لەوێ دەبینران بە شەلی ڕێی دەکرد، کاتێك دکتۆر مارلین سەیری قاچەکانی دەکرد..

دکتۆر میللەر وتی: لە سایەی کەمئەندامییەکەمەوە دەتوانم بە ئاسانی لە نەخۆشەکانم تێبگەم، تەنانەت ئەو منالانەش کە پێم دەڵێن:"شەل" هیچ بێتاقەتو بێزارو تووڕە نابم!

ئەم ناوەی کە پێم دەڵێن شەل، لە ناوە ڕاستەقینەکەی خۆم کە "پادیوس"ە زیاتر پێم خۆشە، خێزانەکەم ئەو ناوەیان لێ ناوم بە یادگاری ئەو دکتۆرە گەنجەی کە لە کاتی لە دایك بوونمدا یارمەتی داوەو ڕزگاری کردوم!

دکتۆر پادیوس مارلین تووشی شۆك بوو، بیری لە قسەکانی ئەو شەوەی دەکردەوە کە لەساڵەکانی خوێندکاریدا چۆن یارمەتی منالێکی دا کە بە ئاشکرا دیار بوو کە ئەو منالە شەل دەردەچێت!

«ئەم منالە لە ژیانیدا سوودی بۆ کێ دەبێت؟» بەڵێ بۆ خۆی بوو، هەر ئەو دکتۆرەی کە ژیانی ڕزگار کردبوو!

دکتۆر پادیوس مارلین دەستی میللەری گرتو داوای لێکرد کە یارمەتی نەوەکەی بدات، تا بتوانێت دووبارە بڕوات!

پاشان وتی: کەمئەندام بوون زۆر باشترە لە بیرکردنەوە کەم ئەزموونییەکانی من.



# با لە کاتی کێشەدا بیربکەینەوە!

خەندە عوسمان

لە گەرمەی توڕەیی و پەستیدا، لە قوڵایی ڕق و قیندا، واهەست دەکەیت کە چەقی دنیایت هەر کێشە لە دەرگای ماڵی تۆ دەدات، وادەزانیت دنیا بە سەر تۆدا ڕووخاوە، شاخەکانی خەمو خەفەت بەس تۆ هەڵتگرتووە، واهەست دەکەیت کە هیچ هیوایەکت نەماوە بۆ ژیان تەنهاو تەنها هەر تۆی خەمبار، دۆستو دوژمن ناناسی، وا دەزانیت خوای گەورە بەڵاو نەهامەتی هەر بۆ تۆ ناردووە، بیروبیرۆکەی خراپت بۆ دێت.

بەڵام یەك چرکە ڕاوەستە با پێکەوە بیر بکەینەوە، تۆ هەر ئەو مرۆڤە نەبوویت کە بەرگەی زۆر کێشەی لەوەسەختت گرت؟

بەرگەی هەموو ئازارەکانت گرت؟ بیرت بێت کە خوای گەورە منو تۆو هەموومان تاقی دەکاتەوە، تا فێری وانەیەکی ژیانمان بکات، ئەویش ئارامگرتنە، ئەو کێشانەی کە لە ژیان دێتە ڕێمان هەموویان وەك وانەیەك وان، بێئەوەی پێویست بە مامۆستا بکات، لە ڕێگەیەوە ئەزموونەکانی ژیان فێردەبین، فێری ئارامگرتنی زیاتر، هەست بە کەسانی بەرامبەرو کێشەو گرفتەکانیان دەکەین، با لە کاتی کێشەو توڕەبوونماندا بیر لەوە بکەینەوە کە پەروەردگاری باڵادەستو میهرەبان بە ڕەحمو بەزەیی چۆن ئاگادارو چاودێری منداڵە لە ناو سکی دایکیدا، یان ئەو منداڵەی کە هێشتا نازانێت وشەی بابە مانای چییە، یان ئەو کەسانەی کە لە ژیانیاندا کەسانێکی ئازیزو خۆشەویستیان کۆچی دوایی کردووە، یان ئەوانەی یەکێ لە ئەندامەکانی جەستەیان لە دەست داوەو چەندان کێشەو گرفتی تر کە بووەتە هۆی خەمو خەفەت، ئایا ئەوان پێویست دەکات بووەستنو واز لە ژیان بهێنن؟

بێگومان نەخێر، چونکە ئەگەر ئەوانیش بووەستن ژیان هەر بەردەوامە، مەرج نییە هەموو ڕۆژەکانی تەمەنت بە ناخۆشی بەڕێ بکەیت، خۆشی بەڕێوەیەو هەر دێتو لە دەرگات دەدات، چونکە تۆ بەرپرسیاری ئەو ڕۆژانەیت.

کەواتە با لە کاتی ناخۆشیو گیروگرفتدا زەردەخەنەو پێکەنین لەسەر لێوانمان نەتۆرێت، هەر چەندە کێشەکان گەورە بن، چونکە بە خەمو خەفەت خواردن هیچ لە کێشەکە ناگۆڕێت، جگە لەوەی کە کێشەکە لەسەر خۆت گەورەترو قورستر دەکەیت، خوای گەورە دەفەرموێت: (ومن یتق اللە یجعل لە مخرجا)، کەواتە فرمێسکەکانت بسڕەو پێبکەنە، پشت بە خودا ببەستەو کێشەکانت لەلا ئاسان دەبێتو لادەچێت.



زاهیر زانا

# گەشبینی و گشتبینی

تێڕوانینو تێگەیشتنی ئێمە بۆ هەر بابەتو بارودۆخو ڕووداوێك، ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لەسەر چۆنییەتی مامەڵەی ئێمە لەگەڵ ئەو بارودۆخە، هەروەها کاریگەریشی هەیە لەسەر هەڵسوکەوتو کاردانەوەو ڕەفتارو کەسایەتیمان.

بۆ ژیانێکی تەندروست تێگەیشتنی دروستو ڕێكو پێكو واقیعیو گەشبینانە پێویستە بۆئەوەی دۆستانە لەگەڵ ژیانو لەگەڵ ڕووداوەکاندا ڕێ بکەینو لەو ڕێگەیەشەوە بە ئومێدو خۆشییەوە بۆ باقی ژیان بڕوانینو ڕوداوو بەربەستو ئاستەنگەکان وەك خۆیان ببینینو بتوانین لەسەر ڕێڕەوی بەرەوپێشچوونو گەشەسەندن بەردەوامبینو خۆمان بەدووربگرین لە ڕەشبینیو کورتبینیو کەمبینیو خراپبینی.

چونکە هەر یەکە لەم جۆرە بینینانە نەخۆشییەکی کوشندەو بەڵایەکی نالەبارن، ئەگەر ڕووبەڕووی مرۆڤ ببنەوە، ئێمەش لەم نووسینەدا دەمانەوێت چۆنێتی ژیانکردن لەگەڵ ڕووداوو پێشهاتەکان ڕوون بکەینەوەو بەربەستەکان تێپەڕێنینو گرێکان بکەینەوە، بۆئەوەی لەو ڕێگەیەوە ئاسودەترو سەرکەوتوانەتر بژین.

گەشبینی بە مانای ئەوەی کە بە ئەرێنیانە لە شتەکان بڕوانین، تەنانەت بە ڕێگرو ئاستەنگەکانیشەوە، گشتبینیش فراوان بینیو فرە بینییە، واتە دەبێت لەوە تێبگەین ژیان تابلۆیەکی هەمە ڕەنگەو بۆ نەخشاندنیشی پێویستە هەموو ڕەنگەکان بەکاربێت هەر لەسەرکەوتنو شکستو لەشساغیو نەخۆشیو گریانو پێکەنینو گەنجیو پیریو ...هتد.

ئەم فرە ڕەهەندییو هەمەچەشنەیەی دونیایە کە هاوسەنگی دروست دەکاتو تامو ڕەنگو بۆنی ژیان نوێ دەکاتەوەو پەڕەی تازەمان پێ هەڵدەداتەوەو چاویلکەی چاومان دەگۆڕێتو وامانلێدەکات جارێکیترو جۆرێکیتریش چێژ لەم دیارییە مەزنەی پەروەردگار وەربگرینو نرخی ئەو هەموو بەخششە بزانین کە پێمان دراوە. هەروەك چۆن ڕێگرەکانیش وانەو ئامۆژگارین، هەرچی گرێکانیشە کردنەوەیان چێژ بەخشەو تەنها لە دوای کردنەوەشیانە کە نهێنییەکەمان بۆ ئاشکرا دەکاتو ئەرێنی بوونی ئەو گرێیەمان بۆ دەردەکەوێت کە بە نەرێنی لێمان دەڕوانی.

ژیان ڕێگەیەکی دوورودرێژە، ئەستەمەو ناگونجێت پێچاوپێچیو هەورازو نشێوی تێدا نەبێت، کە ئەمەش خۆی سیفەتێکی جوانی ژیانەو ئەگەر ڕێگەیەکی ڕێك بێت، ئەو کاتە ئێمەی شوفێر کەمتر چێژ لە دیمەنی دەوری ڕێگاکە وەردەگرینو ڕێگاکەش کورت دەبێتەوەو زوو دەبڕێتەوە، بۆیە گەشبینبە بە بوونی هەورازو نشێویو گشتبینبە بەوەی کە ڕێکیو تەختی ڕێگاکە زۆر کەمترە لە ئاستەنگو خوارییەکانی، گەشبینبە بەوەی ناڕەحەتیو ناخۆشیو سەختیت دێتە ڕێ، چونکە ئەوە بۆ ئەوەیە ئەزموونو خۆڕاگریت پێ ببەخشێت، ئەوە وانەیەو خاڵی هێزە، هەروەك چۆن ئاسنگەرێك کاتێك بیەوێت لە پارچە ئاسنێك شتێك، یان کەرەستەیەك دروستبکات، ئەوا دەیکاتە ناو کورەی ئاگرەکەوە تا سور دەبێتەوە، پاشان دەریدەهێنێتو پیای دەکێشێت بۆئەوەی ئەو شێوەیە وەربگرێت کەخوازراوو بەسودو پێویستەو نرخو بەهاشی بەرز دەبێتەوە، یان نانەوا بۆ دروستکردنی نان هەویرەکە دەشێلێتو خڕی دەکاتەوەو دەیکاتە گونكو پاشان پانی دەکاتەوەو دەیکاتە تەنورەکەوە تاببرژێت، ئەو کاتە پێی دەڵێن: نانو دەچێتە سەر سفرەو خوان، بەشێکی زۆری ئەو گرفتانەی دێنە ڕێگەمان بەم شێوەیەنو دواجار خێرێکیان تێدایە. کەواتە گەشبینو گشتبینبە!

گرنگە کەسایەتییەکی پشوودرێژو گەشبین بۆ خۆمان دروست بکەینو گشتبین بینو بە تەنها هەڵوێستێك بڕیار نەدەینو لە هەموو گۆشە نیگاکانەوە بۆ بابەتەکان بڕوانینو تەنها حاڵەتو هەڵسوکەوتێك نەکەینە پێوەر، بەڵکو هەموو شتێك بە هێندەی خۆیو لە کاتو ساتی خۆیدا ببینینو بە پێوەری خۆی بیپێوین، هەمیشە بە گەشبینانە بۆ داهاتوو بڕوانینو هیوامان وابێت سبەیمان

لە ئەمرۆمان باشترو خۆشتر بێت، وەك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) دەفەرموێت: (تفائلوا بالخير تجدوه).

مرۆڤی مەزن نابێت لە هیچ کاتێکدا مۆمی هیوای بکوژێتەوە، تەنانەت لە ناو دڵی سەختییەکانیشدا دڵنیایە کە تەنگو چەڵەمەکان لادەچنو خۆری ڕۆژێکی نوێ هەڵدێت!

تۆش هەمیشە بە گەشبینییەوە بەردەوامبەو ئەگەر لە هەزار دەرگاتداو نەکرایەوە، بە ئاسانیو بە ئاسایی هەنگاو بۆ هەزارو یەکەم بنێو بزانە نسیبی تۆ بۆ چوونە ژوورەوە ڕەنگە لەم دەرگایەوە بێت، وەك وتراوە: (ڕەنگە لەو کۆمەڵە کلیلەی بەدەستەوەیە، کۆتا کلیل دەرگا داخراوەکە بکاتەوە).

هەرگیز لەو کەسانە نەبیت لە ڕوانینیان بۆ پەرداخ، نیوە بەتاڵەکەی دەبینەنو لە تەماشاکردنی گوڵێکی ڕازاوەو بۆنخۆش باسی دڕکی ژێر گوڵەکەت بۆ دەکەن، تۆ نیوەی پڕو نیوە بەتاڵەکەی پەرداخەکە ببینەو لە کاتی دەستبردن بۆگوڵدا دڕکەکەشی فەرامۆش مەکە، بەمەش گەشبینو گشتبینی! ئەوکاتە دەڵێیت: پەرژینی باخی گوڵ، بە دڕك دەکرێت، کەواتە دڕکیش سودو کەڵکی خۆی هەیەو بەبوونو بینینی نیگەرانو بێزارنیتو خۆتیشی لێ دەپارێزیت.

گەشبینو گشتبینبە بەرامبەر ژیان، هەڵەی هاوڕێییەکت نیشانەی هەڵەی هاوڕێییەتی نییە، جیابوونەوەی دوو هاوسەر، نابێتە بەڵگەی هەڵەبوونی هاوسەرگیری، زەرەرکردنی بازرگانێك، ناکاتە ئەوەی کەسانی تر واز لە بازرگانیکردن بهێنن، ئەگەر هۆکارێکت بینی بۆ نیگەرانیو دڵتەنگیو وازهێنان، هەموو ئەو هۆکارانە ببینە بۆ خۆشبەختیو شادمانیو بەردەوامی، وەك چارلی چاپلن دەڵێت: (کاتێك ژیان ١٠٠ بەڵگە نیشاندەدات بۆ گریان، من هەزار بەڵگە دەخەمەڕوو بۆ پێکەنین)، لە کاتێکدا وەستان لە ترافیك دەیەوێت بێزارم بکات، من سوپاسی خوادەکەم کە ئۆتۆمبێلم هەیە، بۆیە لە ترافیك وەستاوم، کاتێك جەستەم ئازاری هەیە، سوپاسی خوادەکەم کە ئەمە نیشانەی ئەوەیە کە هەستە دەمارەکانم کاردەکەن)، بەم شێوەیە ژیان تامو بۆنێکی خۆشتری هەیەو تەواو لەززەت بەخشو خۆشی هێنەرە.



سپێدە هورمزیار

# ڕێڕەوی دووربوون لە شکست

لە دواجاردا بە هۆی ئەزموونی زۆری ژیانمەوە کە بەرهەمی زۆری هەڵەکانم بوون، لە ژیانی تایبەتی خۆم تێگەیشتم، کە بەشێك لەو شکستانەی لە ژیانمدا دووچاریان بووم، هۆکارەکەی ئەوەبووە کە نەمویستوە ڕاوێژ بە کەسانی دەوروبەرم بکەم، یا لە کاتێکدا ئەگەرچیش بێئەوەی من داوای ئامۆژگاریو ڕێنمایم لێ کردبن، ڕێنماییان کردوم بۆ ڕێگەی سەرکەوتن، سەرەڕای ڕاستو دروستی بۆچوونەکانی دەوروبەر، بەڵام من گوێم نەگرتووەو وام هەست کردووە کە زیرەکی خۆم بەس بووە لەوەی لە کارەکانم سەرکەوتن بە دەستبهێنم، بۆیە دەشێ بەشێك لە ئێوەش ئارەزووی ئەوە نەکەن کە ڕاوێژ بە ئەوانی تر بکەن، هەڵبەتە وەها بیرکردنەوەیەك بێ هۆکارنییە، خۆتان لە نهێنی کاروهەڵسوکەوتی خۆتان زیاتر شارەزانو دەزانن کەچی دەکەن، بەڵام هەرچییەك بێت ئەو کەسانەی بەو شێوەیە بیردەکەنەوە لە هەڵەدان، چونکە ئەگەر واهەست بکەن کە خۆتان هەموو شتێك دەزاننو پێویستیتان بە هیچ کەسێك نییە، لەو بڕوایەدان کە ئەگەر ئێوە ڕێنمایی لە ئەوانی تر وەربگرن، ئەوە ئەوان شانازی بەسەر ئێوەدا دەکەن، لەسەنگی کەسایەتی گرانو سەنگینتان سوك دەکەن، یاخود بە هەر جۆرێك کە بیردەکەنەوە ئەوا دووبارە دەڵێم هەڵەن، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەگەر ئێوە پێداگری نەکەن لەسەر هەڵەکانتانو بۆچوونەکانتان، ئەوە دەتوانن سەرکەوتن بەدەستبهێننو بە هۆیەوە ئاسودەیی لە ناختاندا دەستەبەربکەن.

ئایا لە قورئانی پیرۆزدا، یان لە کۆڕو کۆبوونەوەکاندا، کاتێك باس لە بەسەرهاتی یوسف پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) دەکرێت، کاتێك خەو دەبینێتو دەڕوات ڕاوێژ بە باوکی دەکات، سەرسامی داتان ناگرێت؟ ڕەنگە بڵێن وەها هەڵسوکەوتێك پێویستی بەسەرسامی نییە، چونکە هەمووان ڕاوێژدەکەن، دژی بۆچوونەکانتان نیم، بەڵام هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە ڕاوێژکردن کارێکی ئاساییە، زۆریش گرنگە، بەڵام مەرجی سەرکەوتنی کارەکانتان لەوەدایە کە وەك یوسف پێغەمبەر ڕاوێژکردن ببێت بە ڕەفتاری سەرەکی لە ژیانی تایبەتیتانو لە سەرەتای تەمەنتان، خۆتانو منداڵەکان ڕابهێنن لەسەر ڕاوێژکردن بە دەوروبەر.

لەبەرئەوە گرنگە بۆ دووربوون لە ڕووبەڕووبونەوەی هەرشکستێك ئێوە بۆ کارە تایبەتیو گشتییەکانتان ڕاوێژبکەن، بە تایبەت بۆ مەسەلە چارەنوسسازەکان، بۆیە کەسانێکی متمانەپێکراوی نزیکی خۆتان دەستنیشان بکەن، بۆئەوەی کە لە بڕیارداندا یارمەتیدەرێکی چاکتان بن، چونکە گەلێجار کێشەکان هێندە سەختو نارەحەتن بۆتان، کە خۆتان بە تەنها توانای ڕووبەڕووبوونەوەتان نییە، وەك ئەوەی کە بتانەوێت دەست بە کارێکی تازە بکەنو زۆریش دوودڵ بن، یان ئەوەی بتانەوێت هاوسەری ژیانتان دەستنیشان بکەن، بۆیە دووبارە ئێوە پێویستان بە کەسانێکی نزیکە کە ڕێنماییتان بکەن، لەبەرئەوە دەکرێت لە یوسف پێغەمبەرەوە فێربن کە چۆن ڕاوێژبکەن، بزانن کە ڕاوێژکردن بە دەوروبەر چەندە لەسەرکەوتنەکانتاندا، ڕۆڵی گرنگ دەگێڕن. لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە ئەو کەسە کێیە کە تۆ ڕاوێژی پێدەکەیت؟




ئا: شکریە شێخانی

مامەڵەکردن هونەرێکی وردو هەستیارە، پێویستە بە نیازو ئامانجی ڕێنمایی کردنی مرۆڤەکان ئەنجامبدرێت، بۆئەوەی خەڵك ئامۆژگارییەکانی ئێمەیان قبوڵ بێت، پێویستە لە خەڵك تێبگەین.

لە پێناو تێگەیشتنمان لە خەڵك، پێویستە سەرەتا لە خۆمان تێبگەین، (چیمان دەوێت، چ شتێك ڕازیمان دەکات، چ شتێك تووڕەمان دەکات، گرنگی بەچی دەدەین؟) ئاشکرایە بنەمای دروستبوونی مرۆڤەکان یەك سەرچاوەیە، دەی خۆ ئێمەش یەکێکین لە ئادەمیزادەکان، خۆئەگەر مرۆڤەکان هەندێك جیاوازییان هەبێت، بەڵام زۆر لە یەکدەچن، ئەو شتانەی کار لەخەڵك دەکات، کار لە ئێمەش دەکات.

- من حەزدەکەم خەڵك ڕێزم بگرێت.

- من حەزدەکەم خەڵك هەستم پێبکاتو گرنگیم پێبدات.

- من حەزدەکەم خەڵك گوێ لە بیرو بۆچوونەکانم بگرن.

- من حەزدەکەم خەڵك ڕەچاوی بەرژەوەندییو حەزو ئارەزووەکانی من بکەن.

هەموو کەسێك ئەم حەزو ئارەزووانەیان هەیە، ئەگەر حەز بکەین خەڵك ڕێز لە حەزو ئارەزووەکانمان بگرن، ئەوە دەبێت ئێمەش ڕێز لە حەزو ئارەزووەکانی ئەوان بگرین، با سەرەتای گەیشتنمان بە خەڵك، لە سنووری تەسکی خۆپەرستیو ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییە تاکەکەسییەکانمان دەرچین، لەگەڵ دوورکەوتنەوە لە بەکارهێنانی وشەی (من)، با بیگۆڕین بە وشەو دروشمی ئێمەو ئێوەو تۆ، ناسکترو جوانترە.

زۆربەی خەڵك وشەی (من) زۆر بەکاردەهێنن، جا ئەگەر ئێمە بمانەوێت کاریگەریمان لەسەر خەڵکی هەبێت، پێویستە ئەم وشەیە بۆ ئەوان جێبهێڵین، بەڵکو درووشمی ئێوەو تۆ، ئینجا ئێمە بەرزکەینەوە. ئێمە واڕاهاتووین ڕێز لە کەسانی خاوەن پایەو پلەو سەروەتو سامان دەگرین، چونکە ئەوان گرنگن! ئایا هیچ کەسێك هەیە لەم گەردوونەدا خۆی بە گرنگ نەزانێت؟!

ڕێزگرتنو بە گرنگ سەیری خەڵککردن، کلیلی ڕێککەوتنە لەگەڵیاندا، دیارە ئێمە واڕاهاتووین هەڵەی کەسانی بەرامبەرمان گەورە دەکەین، زۆرجار سەرزەنشتیان دەکەین، بەڵام هەڵەکانی خۆمان بچووك دەکەینەوەو بە ئاسایی دەزانین، دەڵێین (کل بنی ادم خطاء وخیر الخطائین توابون)، دیارەبوونی هەستی پێچەوانە، سوودی زۆری بۆ هەردوو لا دەبێت، چاوپۆشی هەڵەکانی خۆمان نەکەین لەگەڵ هەوڵی بنبڕکردن، هەڵەی کەسی بەرامبەریش بە کارێکی ئاساییو سروشتی بزانین، مادام مرۆڤ هەڵە دەکات. بوونی ئەم هەستە سوودی زۆر بۆ دڵو دەروونمان دەبێتو لە خەوشوگەرد پارێزراو دەبێت، بە شێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ کەسانی دەوروبەرمان هەڵدەکەین.

ڕێزگرتنی ڕاوبۆچوونی کەسانی بەرامبەر هەرچەندە بە بۆچوونی ئێمە هەڵە بێت، دەتوانێت کۆمەڵێك خاڵی هاوبەش لە بیروبۆچوونەکانمان بە دی بکەین، خاڵە هاوبەشەکان دەستپێکی وتوێژمان بێت، پاشان بیروبۆچوونە جیاوازەکان بە نەرمیو ئارامی گفتوگۆی لەسەر بکەین، بەڵام بەبێ وتووێژی توند، چونکە جدال جەنگێکی دۆڕاوە لە گشت کاتو شوێنێك، خۆخزاندنە نێو جەنگێکە کە هەر لە سەرەتاوە دۆڕاندنی مسۆگەرە، نیگەرانیو دڵتەنگیو پەیوەندی پچڕان بەرهەمی دەبێت، هەرچەندە بەڵگەو دەلیلی بەهێز هەبێت. لە یاد ناکەین هەر گفتوگۆیەك دڵسۆزیو ڕاستگۆیی تێدانەبێت، مەحاڵە سەرکەوتن بەرهەمی بێت.

هەڵبەتە سروشتی هەموو مرۆڤێك خۆشەویسترین ناو، ناوی ئەو کەسەیە کە هەرچەندە سەیری ئاوێنە بکات دەیبینێت، لەبەرکردنی ناوی کەسانی بەرامبەرو زۆر دووبارە کردنەوەی لە کاتی وتوێژ، مایەی زیادکردنی خۆشەویستییە لەگەڵ ڕازاندنەوەی لێوەکانمان بە زەردەخەنەی بەردەوام لە کاتی سڵاوو گفتوگۆدا، سەرەڕای بوونی پاداشتی خوداوەند مایەی ڕێزو خۆشەویستیو گەشانەوەی دڵەکانە، زانایانیش وتوویانە:

١- زەردەخەنە جوانە لە کاتی خۆشیدا، بەڵام لە کاتی ناخۆشیدا جوانترە.

٢- زەردەخەنە جوانە لە کاتی قازانجکردندا، بەڵام لە کاتی زەرەرکردن جوانترە.

٣- زەردەخەنە جوانە لە کاتی وەرگرتن، بەڵام لە کاتی بەخشین جوانترە.

زۆر گوێگرتنو کەم قسەکردن لە ئاکارە جوانەکانی کەسی سەنگینە، هەر بیروبۆچونێك دەکرێت بە چەند وشەیەکی کەم دەرببرێت، هەرچەندە وتەکان زۆر بن هەڵەی زیاتر ی تێدا بەرجەستە دەبێت، گوێگریش تووشی بێزاریو هەراسان دەبێت، ڕەنگە شەرم بکات ڕوو وەرنەگێرێت، بەڵام بیروهۆشو هەستی بە لایەکی تردا دەچێت.

خۆ بە گەورەدانان ئاکارو ڕەوشتی پەروەردگاری باڵادەستە، مافی خۆیەتیو تایبەت بە ئەوە، بڕواداری ڕاستەقینە دەزانێت خاکی بوون، مایەی قبوڵو پایەبەرزی ئەوە لە زەمینو ئاسمان.

مرۆڤی خاکیش ڕاوبۆچوونەکانی خۆی بە یاساو ڕێسا نازانێت، شکاندنی وتەکانی بە هێڵی سوور دانانێت، بەڵکو ئەم ڕاستییە لای ئەو چەسپاوە، وتەو بیروبۆچوونی هەموو کەسێك مایەی قبوڵکردنو ڕەتکردنەوەیە، تەنها وتەو بیروبۆچوونی خوداوەندو نێردراوەکەی نەبێت، ئەوەتا ڕۆژگار ئەمەی سەلماند، چەندەها بیروبۆچوون تا دوێنێ ڕاستودروستو حەقیقەت بوون، کەچی ڕۆژگار نەشیاویو ناهاوسەنگیو نەگونجانی سەلماند.

ئاشکرایە وشەی ناسكو جوان لەگەڵ سوپاسگوزاریو داوای لێبوردن، لا بەری گەردە بچووکەکانە، سەرەڕای زیادبوونی ڕێزوخۆشەویستیو دانان بە هەڵەکانو نە دۆزینەوەی بەهانە خورەوشتێکی جوانو بەرزە، باشترین بەهانە بۆ هەڵەکان، دانانە بە هەڵەکاندا!

دیارە فەرمانکردن بە خەڵك، پێویستی بە هونەرە، وەك بەکارهێنانی (ڕات چۆنە ئەگەر وابکەین؟)، یان (ئەگەر وابکرێت باشتر نییە؟) زۆر چاکترو ویستراوترە لە (وابکە)، یان (پێویستە ئەم کارە بکەیت).

لە کۆتاییدا دەڵێم: دەبا دڵمان پاكوبێگەرد بکەین، داهێنانو سەرکەوتنی خەڵك، بەداهێنانو سەرکەوتنی خۆمان بزانین، بە خۆشییەکانیان دڵخۆش بین، هەڵەو شکستی ئەوان بە هەڵەو شکستی خۆمان بزانین، هەڵەکانی ئەوان مایەی نیگەرانیمان بێت.

سەرچاوەکان:


١- فن التعامل مع الناس والتأثير فيهم/ صلاح صالح معمارز

٢- استمتع بحياتك/ د. محمد العريفي.




# بۆ ڕەواندنەوەی خەمو پەژارەکان

ن.د. جاسم موتەوەع - و: خالد محەممەد

هەرکات کەسێك دەبینم خەمبارە، بێزارە، بریندارە، کۆڵی پەژارەی داوە بە کۆڵیدا، جا ئیتر بە هۆی کێشەی خێزانییەوەیە، یان بە هۆی زەرەرو زیانی مادییەوەیە، یان بە هۆی نەخۆشییەوەیە، یان بە هۆی لە دەستدانی یەکێك لە خۆشەویستانییەوە بێت، ئامۆژگاری دەکەم سورەتی یوسف بخوێنێتەوە.

جارێکیان کەسێکم بینی لەو حاڵەدا بوو کە لە سەرەوە وێنامان کردووە، ئامۆژگاریم کرد بە خوێندنەوەی ئەو سورەتە، پاش دوو ڕۆژ هاتەوە بۆ لام، پێی وتم: سوێند بەخوا هەرگیز نەمزانیوە سورەتی یوسف، بەو جۆرە ڕەوێنەری خەموپەژارەو ناخۆشییەکانە.

منیش پێم وت: کاتێك ئەو ڕێگەچارەیەم نیشانداى، من دڵنیابووم لە دەرەنجامەکەی، دەزانی بۆچی؟

وتی: بۆچی؟

وتم: لەبەرئەوەی خوای گەورە ئەم سورەتەی لە ساڵی ماتەمیدا دابەزاند، ئەو ساڵەی کە هەردوو کۆڵەکەی بانگەوازی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لەسەر بێت)، کە خاتوو خەدیجەو ئەبوتالیبی مامی بوون، وەفاتیان کرد، ئەو خۆشەویستەش هەرکات ئەم سورەتەی دەخوێند هەستی بە ئارامی دەکرد، خەموئازارەکانی کەم دەبووەوە.

وتی: پاکوبێگەردی بۆ خوا، بە ڕاستی یەکەمجارە ئەمە دەبیستم!

منیش وتم: پاشان سورەتی یوسف کێشەی زۆری تێدایە کە ڕووبەڕووی یوسفی ڕاستگۆ بوونەوەو ئەویش توانیویەتی بە باشیو سەرکەوتووانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات.

وتی: ئەو کێشانە چین؟

وتم: کێشەی سیاسی، ئابوری، پەروەردەیی، ئافرەتان، کێشەی ڕاگەیاندنو چەندین شتی تر، هەروەها هەستو شعوری زۆری، وەك: هەستو شعوری ستەملێکراو، چۆنییەتی مامەڵەی لەگەڵ ستەمکار، هەستو شعوری ناپاکی، هەستوشعوری خەموپەژارە، هەروەها بەروبوومی ئارامگریو بیروباوەڕو کرانەوەی دەروازەکانی ڕەحمەتی خواییو بەروبومی سەرکەوتنو کۆڵنەدانو بەردەوامی، کێشەو موسیبەتەکەت هەرچییەك بێت، هەستوشعورت هەرچۆنێك بێت، خۆت لەو سورەتەدا دەبینیتەوە.

وتی: ڕاست دەکەیت، منیش ئامۆژگاری کەسوکارو هاوڕێکانم دەکەم بە خوێندنەوەی.

وتم: منیش هەروەها ئامۆژگاری هەموو خەمبارێك دەکەم، ڕۆژی دووجار ئەم سورەتە بخوێنێتەوە، ئەو کات تێبینی گۆڕانکاری دەکات لە دەروونیدا.

ئەویش وتی: من شایەتی دەدەم لەسەر ئەوە، وەك وتراوە (اسأل مجرب ولاتسأل طبيب).

منیش دەستم کرد بە پێکەنین.



# هاوڕێی چاك بە

ئاسۆ حاجی

بۆ هەنگاونان لەگەڵ ڕۆژو شەو، بۆ بەڕێکردنی کاروانی ژیان، پێویستت بە هاوڕێو هاودەم هەیە، دەستخستنی هاوڕێش شوێنی زۆری هەیە، وەك: (قوتابخانەو زانکۆو فەرمانگەکانو هەروەها لە نێو بۆنەو شوێنەگشتیەکانیشدا)، بەڵام گرنگە بزانیت کێ دەکەیت بە هاوڕێی خۆت، ئەو هاوڕێیەی کە نهێنییەکانتی لە لایەو دەیپارێزێت، کەسی ڕۆژی تەنگانەیە، بەخۆشییەکانت خۆشحاڵەو بۆ ئازارەکانت نیگەرانە، چونکە کاتێك بوونە هاوڕێو دۆستی یەکتری هەوڵدەدەن لە نێو دڵە بچکۆلانەکەی یەکتری جێگا بۆ یەکدی بکەنەوە، ئەم کارەش گەورەترین خەڵاتو بەخشینە بۆ یەکتری، ئەگەر توانیتان وابکەن، چونکە دڵ مەڵبەندی خۆشەویستییەو بە بوونی خاوەن خوێن هەموو ساتێك بە بەردەوامی لەو ڕۆژەی کەدروست بووە، سەردانی گشت ئەندامەکان دەکات، بە بێ ماندووبوون.

جۆری هاوڕێیەتییەکەو توندووتۆڵی نێوانتان دەگەڕێتەوە سەر جۆری پەیوەندییەکانتانو ڕێژەی هاریکاریو سەردانو بە یەکەوەبوونتان.

ئەگەر لەگەڵ هاوڕێییەکەت گفتوگۆتان کرد، دەربارەی بابەتێك تەنها مەڵێ: بەڵێو سەری بۆ بلەقێنی، لە کاتێکدا باوەڕت بە بۆ چوونەکەی نییە، پاشان لە شوێنی تر باسی بکەیتو گاڵتە بە بۆچوونەکەی بکەیت، بزانە هەرچەند هەڵە بێت لە تۆ باشترە، چونکە ئەو توانی بیروبۆچوونی خۆی دەرببڕێت، بەڵام تۆ چیت کرد؟! یان وابیرمەکەرەوە ئەوەی تۆ دەیڵێیت ئەو پێی ڕازیبێت.

ئەگەر بوویت بە هاوڕێی کەسێك کە لەگەڵ پیشەکەت جیاوازبوو، هەوڵمەدە لەگەڵی بچیتە هەموو شوێنێك کە هیچ پەیوەندی بە تۆوە نەبێت، چونکە ئەوان کە گەیشتن بە یەك دەربارەی پیشەی خۆیان گفتووگۆ دەکەن، بە زمانی کارەکانی خۆیان دەدوێن، تۆش هیچ تێناگەیت، بەڵکو کە پێکەنین تۆش پێدەکەنی، یان بانگهێشتکرابوو بۆ ئاهەنگێك، یان چێشتخانە، یان ماڵێك لەگەڵ هاوپیشەکانی، ئەگەر پێشی وتی: وەرە لەگەڵمان هەوڵبدە نەڕۆیت لەگەڵیدا، چونکە دووبارە تۆ دەبیت بە کەسێکی کەڕولاڵ، نەتێدەگەیت، نەدەشزانی وەك ئەوان بدوێیت.

ئەگەر هاتوو سەفەری کرد بۆ هەر شوێنێك، کە پێت دەڵێت: چیت پێویستە؟! تۆ بەبێ هۆ، یان بەبێ پێویستی، مەڵێ فلانە شتم بۆ بێنە، ئەگەر بوویتە هاوڕێی هەر کەسێك هەوڵبدە بە پێی توانای ئەو داوای شتی لێبکە، نەك کارێك کە لە توانایدا نەبێت تۆ داوای لێبکەیت، هەوڵیش مەدە هەموو سکاڵایەکی حاڵی خۆتی بۆ بکەیت، چونکە لەوانەیە لە بەردەمی تۆ هەوڵێك بدات بۆت چارەسەربکاتو پەیوەندی بە چەند کە سێکەوە بکاتو لێیان دەپرسێت، بەڵام لە کۆتاییدا هیچ ئەنجامێك نادات بە دەستەوە، چونکە لە توانای ئەودا نەبووە.

ڕەوڕەوەی ژیان بەردەوام دەبێت لە ڕۆیشتن، مەرجیش نییە هەموو کاتەکانی بە یەکەوەبوون خۆشی بێت، یان لە یەك ڕازیبوون بێت، چونکە زۆرجار بووە دووکەس لەسەر وشەیەکی کەم، یان ڕووداوێك لێك دەڕەنجێن، بێئەوەی هیچ حیسابێك بۆ یادگارییەکانی ڕۆژانی ڕابردوو بکەن، هەریەکەیان لە ئاست خۆی دڵی پڕخەم دەکاتو دەموچاوی پڕ لۆچ دەکات، هەر یەکەیان لە ناخی خۆیدا لە یەکتری پەشیمان دەبنەوە، جا زۆرجار ئەوەی کارەکەی بۆکراوە، یان یارمەتیدراوە، هەردەم خۆی بە شەرمەزار دەزانێت بەرامبەریو خۆزگە دەخوازێت کە هیچ داوایەکی لێ

نەکردبایە، هەتا ئەمڕۆ بەرامبەری ئاوا خۆی بە شەرمەزار نەهاتبایە بەرچاو، هەتا ئەگەر بەرامبەرەکەشی هەڵەی هەبێتو ستەمی لێبکاتو مافی بخوات، ناتوانێت هیچ قسەیەکی وای پێبڵێت کە خۆی لەسەرحەقە، چونکە هەردەم ئەو ڕۆژەی دێتەوە بەرچاو کە بەرامبەرەکەی فلانە ڕۆژ، یان فلانە جار، ئەو یارمەتییەی داوە، یان کارێکی بۆ کردووە، لە هەمان کاتدا ئەوەی بەرامبەری هەردەم ئەوی تر بە قەرزدار دەزانێتو پەشیمانە کە یارمەتیداوە، کە لە کاتێکدا پێی دەگوت چیت دەوێت لە خزمەتدام هیچ منەتی تیانییە.

لەبەرئەوە بزانە ئەوەی دەیکەیت بە هاوڕێی دڵسۆزت، تا چەند لە کاتی پێویستدا بەهاناتەوە دێت، بێئەوەی چاوەڕێی پاداشتو پیاهەڵدان بێت. چونکە ژیان هەزاران بەرزونزمی تیایەو تۆش دەبێت ئەو ڕۆژانەت لە پێش چاو بێت، ئەگەر نێوانتان تێکچوو، چی؟!

بەڵام هەوڵ مەدە گومانی خراپی پێ ببەیتو هەڵە بچووکەکانیشی لێ گەورە مەکەو هەردەم بۆی لە بۆسەدا مەبە، هەر کە هەڵەیەکی کرد لێی بکەیت بە هەڵا، چونکە بنیاتنانی هاوڕێییەتی چاکو دڵسۆز، ئاسان نییە، بەڵام تێکدانی زۆر ئاسانە، تەنانەت ئەگەر بە یەك ئیشارەتیش بێت.

بۆیە هەوڵبدە هەردەم بۆ هاوڕێکەت هاوڕێی چاك بە، خۆت بە هەڵەکانییەوە خەریك مەکە، چونکە چاکەی زۆری لەگەڵدا کردوویت، گرنگترینیان توانیویەتی لە نێو ئەو دڵە بچکۆلانەی خۆی کە مەڵبەندی خۆشەویستییە جێگایەك بۆ تۆ دابنێت، گوێچکەکانی بە ئاوازی دەنگی تۆ پڕبکاتو زوبانی چەندان جار ناوی تۆی هێناوەو مەدحو سەنای تۆی پێکردووە، ئا ئەم چاکانە ئاسان نین کەسێك بتوانێت لە نێو ئەو هەموو خەڵکەدا تۆ هەڵبژێرێت. ژیان چەندەی بە خۆشی بژی ئەوەندەی خۆشە، بۆ سامانی ژیانی کۆمەڵایەتیش هاوڕێییەتی یەکێکە لە دەسکەوتە هەرە گرنگەکانی، ئەگەر بتوانی بە دەستی بهێنیتو بیپارێزیتو بە ئاسانی لە دەستی نە دەیت، چونکە دەستکەوتنی گەنجینە بە نرخەکانو پڕبە هاکان ماندووبوونێکی زۆری دەوێت، بەڵام بە هەدەردانیان یەك چاوتروکانی دەوێت.



نەریمان قەلاچۆغانی

# بۆ ئاسودەییت

ماڵو سەروەتو سامانم زۆرە، خێزانم پێکهێناوەو چەند کوڕو کچم هەیە، لە هیچ بوارێکدا کەمو کورتیم نییە، خانوو، ئۆتۆمبێلم بۆ خۆمو بۆ کوڕەکانمو بۆ کچەکانیشم دابین کردووە، بەڵام ئاسوودە نیم، خاوەنی بڕوانامەمو موچەکەم زۆرباشە، هەموو پێداویستییەکی ماڵم دابین کردووە، گوزەرانم زۆرباشە، بەڵام ئاسوودە نیم!

ئەمە قسەی زۆرێك لە خەڵکی ئەم سەردەمەی خۆمانە، ئەی هەژارو کەمدەرامەتەکان، دەبێت حاڵیان چۆن بێت، لە کاتێکدا بە بۆچوونی زۆرێك لە خەڵکی ئەم شتانەی سەرەوە هۆکارێکی سەرەکین بۆ ئاسودەییو بە ڕای زۆرێك بەبێ ئەم هۆکارانە ئاسودەیی بەدەست نایە. بۆیە دەتوانین بڵێین زۆربەی زۆری خەڵکی ئێستا ئاسوودە نینو بگرە زۆریش بێزارنو بە گلەیین لە ژیانی خۆیان، جالێرەدا دەمەوێت هەندێك شت بڵێم کە بەو هیوایەم ئەگەر ئاسودەیی تەواویش لە ڕێگەیانەوە بە دەست نەیەت، ئەوا کەمێك ئاسودەییمان پێ ببەخشێت:

١- ئەو بەشەی کە پێتدراوە لە موڵكو ماڵو سامان، لە منداڵو خێزان، زۆر، یا کەم، پێی ڕازیبەو سوپاسگوزاربە.

٢- ئەوەندە وێڵ مەبە بە دوای دنیادا، کە بۆ هەر کاروبارێکی ماددی تێیدا ئامادەییت هەبێت.

٣- خۆت خەریك مەکە بە کاروباری کەسانێك کە پەیوەندی بە تۆوە نییە، بۆ نموونە فلان کەس چۆن ئۆتۆمبێلی کڕی؟ چۆن خانوی کڕی؟ چۆن دامەزرا؟ واز لە پرسیارکردن بێنە لە بارەی کەسانی ترەوە.

٤- هەمیشە جیاوازی خۆت بکە لەگەڵ ئەو کەسانەی کە نەخۆشن، یاخود دووچاری دەردو بەڵایەك هاتوون، یا ئاستی بژێویان زۆر لە تۆ خراپترە.

٥- هاوڕێیەتی کەسانێك مەکە کە ڕەشبینو داڕوخاون، بە پێچەوانەوە هاوڕێیەتی ئەو کەسانە بکە کە هەموو کات بە دەم ژیانەوە پێدەکەننو گەشبینن.

٦- لێبوردەبە، بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی کە هەڵە دەکەن بەرامبەرت.

٧- ڕۆژانە کاتێك تەرخان بکە بۆ بیرکردنەوە لە خودی خۆت، بوونەوەر، ئەو شتانەی کە لە دەوروبەرتدان.

٨- واز لە ڕابردوو بێنە، چونکە ئەوەی ڕۆیی دڵنیابە ناگەڕێتەوە، بە ئەندازەیەك ئەگەربێتو هەموو دنیا کۆببێتەوە ناتوانێت چرکەساتێکت بۆ بگێڕێتەوە، کەوابوو خەمخواردن لە ڕابردوو هیچ سودت پێ ناگەیەنێت.

٩- خۆت خەریك مەکە بە هەڵەی کەسانی ترەوە، چاکتروایە خەریکی هەڵەکانی خۆت بیت.

١٠- بەگوێرەی توانای خۆت، هاوکاری ماددیو مەعنەوی هەژارو لێقەوماوو منداڵانی بێ باوك بکە.



# هۆیەکانی لەبیرچوونەوەو چارەسەرکردنی

ئارام ستار بادلی

زنجیرەی دوو

زۆر سروشتییە مرۆڤ شتی لە بیربچێتەوە، کە ئەمرۆ خەڵکێکی زۆر گلەیی‌و گازندەیان لە دەست ئەم کێشەیەیە، لە هەمان کاتدا لەبیرچوونەوە سوودیشی هەیە، بەتایبەتی کاتێك مرۆڤ شتێکی ناخۆشی بەسەردادێت، دوایی لەبیری دەچێت، چونکە ئەگەر لەبیرچوونەوە نەبوایە، مرۆڤەکە بە بەردەوامی لە نارەحەتی‌و دڵەڕاوکێدا دەژیا، لەگەڵ ئەوەشدا زیانیشی هەیە، کە پێویستە لێرەدا بگەڕێینەوە بۆ عەقڵ، چۆنییەتی هەڵگرتنی بابەتەکان‌و بە بیرهێنانەوەی لە کاتی پێویست، لەبیرچوونەوەش واتا نەمانی توانا بۆ گێڕانەوەی بابەتی پێشوو لە کاتی پێویستدا، بۆ نموونە لە کاتی تاقیکردنەوەدا کریستان دەڵێت: مرۆڤی سەرکەوتوو وەکو درێل کاردەکات، بەشێوەیەك هەموو هێزی خۆی لەسەر یەك خاڵدا کۆدەکاتەوە، لێهاتوویی بلیمەتی ١٪ بەهرەیە، بەڵام لە ٩٩٪ کۆشش‌و هەوڵدانی مرۆڤە.

### ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی لەبیرچوونەوە ئەمانەن:

١-نەبوونی تەرکیز لەسەر زانیارییەکان، بۆ نموونە واخەیاڵ بکە زانیاری لەناو مێشك، وەکو کاغەزێك وایە بە بۆردێکەوە، ئەگەر بە جوانی هەڵنەواسرێت، دەکەوێتەوە خوارەوە.

٢- کۆبوونەوەی زانیارییەکان بەشێوەیەکی ئاڵۆزو قەرەباڵغ لەناو مێشك، واتا ڕێکنەخستن‌و پۆلێن نەکردنیان، بۆیە دواتر بیرهاتنەوەیان کارێکی زۆر قورسە.

٣- دووبارەنەکردنەوەی زانیارییەکان‌و کۆنبوونیان، کە پێشتر خوێندوتەوە، یان پێت وتراون.

٤- وەرگرتن‌و خوێندنی بابەتەکان لە کاتی ماندووبوون‌و نەخۆشی‌و دڵەڕاوکێ، بەبێ پشوودانی مێشك.

٥- دابەشنەکردنی کات بەشێوەیەکی ڕێك‌وپێك‌و بە پلان‌و نەخشە.

٦- گوێ لە خۆنەگرتن، یان نەنووسینەوەی بابەتەکان، یاخود خوێندن لە شوێنی نزم‌و بە پاڵکەوتنەوە، ئەمانە هۆکارن بۆ لەبیرچوونەوە.

٧- بیرنەکردنەوە تەرکیزنەکردن‌و بەکارنەهێنانی مێشك لەبەر نەبوونی متمانە بەخۆبوون.

٨-پشتبەستن تەنها بە لەبەرکردن‌و تێنەگەیشتن لە بابەتەکە، کە زۆر جار بابەتەکان زۆر لێك نزیکن، وادەکات بابەتەکان تێکەڵ ببن‌و لەبیربچن.

٩- خۆ دوورخستنەوە لە زۆرخۆری‌و زۆر نووستن‌و تەممەڵی، کە سەرەنجام هیچ حەزو ئارەزوو بە ئاگایی بوونی نامێنێت.

### چارەسەرکردنی لەبیرچوونەوە:

١- زۆر لە توێژینەوەکان ئەوەیان سەلماندووە مرۆڤ ناتوانێت دوو چالاکی ئەنجامبدات، بۆیە پێویستە لە کاتی خوێندن‌و گوێگرتن، هەموو تەرکیزت بخەیتە سەر بابەتەکەو خەیاڵت لە هیچ کارێکی تردا نەبێت.

٢- بۆ بەهێزکردنی مێشك، پێویستە گرنگی بەشتی بچووکی وەك ساتەکان‌و خولەکەکان بدەین.

٣- دروستکردنی حەزو ئارەزوو متمانە بەخۆبوون بۆئەوەی لە هەراسان بوون‌و بێزاری دووربکەوینەوەو بابەتەکانیش بە تەواوی لەبەربکرێن‌و زوو زوو پێیاندا بچینەوە بە مەبەستی بەبیرهاتنەوە.

٤- هەرکاتێك زانیارییەکت لەبیرچوو، بیری لێبکەرەوەو مەگەڕێرەوە سەر پەرتووکەکە، چونکە ئەگەر بە ئاسانی زانیاری دەربهێنیت، بە ئاسانی لەبیری دەکەیت، واتا خۆت ماندووبکەیت بۆ بەدەستهێنانی زانیاری‌و بە بیرهێنانەوەی.

٥- هەناسەدان بە لووت، بەڵام هەناسەدان بەدەم کاتێك بە قوڵی هەناسە هەڵدەکێشی لە ٨١٪ تەرکیز زیاد دەکات.

٦- زەردەخەنەو دڵئارامی‌و ئاسودەیی مێشك بەهێز دەکات، کەواتە لە کاتی لە بەرکردن‌و خوێندن، مۆن‌و گرژوتوڕە مەبە.

٧- هەر شتێك لەبەر بکەیت، دەبێت جوان تێبگەی، پاشان لەبەری بکەیت‌و کاتی گونجاویش بۆ لەبەرکردنەکە دابنێ، وەکو بەیانیان زوو پێش نووستن، ئەو بابەتانەی لەبەرت کردووە دووبارەی بکەرەوە.

٨- وازهێنان لە تاوان‌و گوناهو خراپەکاری، لە هەموو کارێکدا تەنها پشت بەخوا ببەستە، تاکو لەو پەتایە ڕزگارمان ببێت.

٩- بەستنەوەی هەر زانیارییەك بەشتێکەوە، لە شتەکانی دەوروبەر، تا لە بیری نەکەیت.

١٠-خواردنی ئەو شتانەی کەمێشك بەهێزدەکەن، وەکو گوێزو مێوژو مۆزو خورماو گێزەرو قەیسی، بە مەرجێك بەشێوەیەکی زۆرخۆرانەو بێبەرنامە نەخورێت، هەروەها دوورکەوتنەوە لەو خۆراکانەی کە زیان بەمێشك‌و دەماغ دەگەیەنن‌و زووتر شتەکان لە بیردەبەنەوە، وەکو خواردنە پڕچەورییەکان.



# بۆچی بەرەنگاری گۆڕانکاری دەبینەوە؟!

ئەسکەندەر ڕەحیم

ئەوەی گۆڕانکاری دەهێنێتەوە ئاراوە، قەیرانە.. قەیرانیش تەنگژەی تەمومژاویی ناخۆشە، لەبەرئەوە هەمیشە گۆڕانکاری، پڕئێشو ژانە، مرۆڤیش بە سروشتی خۆی، دڵی بۆ ژینێك -كە پێی ئاشنایە- دەشنێت. ئەو شتەشی پێی هۆگرنەبووەو لەسەری ڕانەهاتووە، لێی دەسڵەمێتەوە. خۆ ئەگەر دڵنیا نەبێت لەوەی هەلومەرجە نوێیەكە، لە پێشتر باشتر دەبێت. هەروەها ئەگەر ناچار بە گۆڕانكاری بكرێت، ئەوا تووشی پەشێویو شپرزەیی دەبێت.

سا لەبەرئەوە، دەبینین: مرۆڤ، بەرەنگاری هەر گۆڕانكارییەك دەبێتەوە، كە دێتە سەر ڕێی ژینیو خوازیارییشی نییە، مەگەر گوشارێكی توندی دەرەكی، تەنگی پێ هەڵبچنێت، لەو گوشارانەش: پێشكەوتنی زانستو تەكنەلۆژیا، پەشێوییە ڕامیارییەكان... هتد.

تا دوێنێ بوو.. ئەوەی جێگیر بوو، ئۆقرەیی بوو، ئەوەشی كاتی بوو، گۆڕانكاری بوو. ئەمڕۆكەش ئەوەی جێگیرە، گۆڕانكارییە، ئەوەشی كاتییە، ئۆقرەییە. ڕەنگە لە سبەینێشدا، پێشبینی گۆڕانكاریی زۆرترو وەستانی ئۆقرەیی بكەیت!

لەبەرئەوە لەسەر گشت كەسێك پێویستە، گەشە بە توانای هەڵكردنی، لەگەڵ ئەو گۆڕانكارییەی بەسەر ژینیدا دێت، بداتو هەوڵی بەرەنگاربوونەوەی نەدات، تا لێی نەشێوێتو ژینی لێ ئاڵۆزتر نەبێتو هەر لە پێستەكەی خۆیدا نەمێنێتەوە، چونكە ئەگەر نەگۆڕێت، ڕێی تێ دەچێت لەناو بچێت، زۆرێكیش لە ئێمە، بەرەنگاری گۆڕانكاری دەبینەوەو ئەو بارودۆخەی ئێستە -كە پێمان وایە، سەقامگیرو ئۆقرەیە- پێ پەسەندترە.

## بۆچی بەرەنگاری گۆڕانكاری دەبینەوە؟!

١- چونكە ئێمە لە پێشبڕكێو ململانێ، دەترسینو پێشبینی باری نالەبارتر دەكەین، تا وەك بولبولی نێو قەفەزمان لێ دێت، كە دەخواتو دەخواتەوەو هەست بە هێمنایەتی دەكات، بەڵام دەرفەتی بەسەربەستی فڕین، لە دەست دەداتو لەناو خەونو خەیاڵی هێمنایەتی درۆینەدا دەژی.

٢- چونكە لە شكست دەترسین، هەروەها لەو سەركەوتنەشی لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتیو پابەندیی پتری لەگەڵدایە.

٣- چونكە لەو ئەركەی پێمان سپێردراوە، نەشارەزاین، بە چەشنێك نەدەزانین چیمان لێ دەویسرێت، نەدەشزانین چۆن ڕایبپەڕێنین.

٤- چونكە گۆڕانكاری پێویستی بە هاوكاری، پشتیوانی، هاوكۆكیی هەوڵەكانو تەبابوونی لایەنە جیاوازەكانە.

٥- چونكە ئێمە، گۆڕینی نەریتە كۆنەكانمان، پێ دژوارەو لەگەڵ ئەرك، پیشە، هەڤاڵەكانمانو كاتەكانی كارمان، ڕاهاتووین. خۆ ئەگەر هەوڵی گواستنەوەمان بۆ پیشەیەكی شایستە، دا.. ئەوا ئێمە لە هەمبەر گۆڕینی گشت ئەو شتانەداین، كە پێیان ڕاهاتووین، وەك گۆڕینی كاتی كەمی كار، بۆ كاتی زۆرتر.. گۆڕینی ئەركی ئاسان، بۆ ئەركی سەخت، گۆڕینی چەند هەڤاڵێك كە پێیان هۆگربووین، بۆ چەند هاوكارێكی دیكە، كە خۆشیمان لێیان نایەت.

٦- چونكە ڕووبەڕووی گوشاری كەسانی دەوروبەرمان دەبینەوە. بۆ نموونە: ڕەنگە خاتوونێك ڕەتی بكاتەوە، بۆ خانوویەكی نوێی بەرفراوانتر بگوازێتەوە.. ئەویش لەبەرئەوەی مانەوەی لە نزیك خزمانی خۆی، پێ خۆشترە. هاوسەرەكەشی، بۆ ئەوەی ژنو مێردایەتییان نەشێوێت، لە بڕیارەكەی خۆی دەكشێتەوە، هەڵبەت بێئەوەی هەوڵی ڕوونكردنەوەی سوودەكانی خانوو گواستنەوە، بۆ خاتوونی خێزانی بدات.

٧- چونكە ئێمە، جارجارە لایەنگری باری نەرێنی دەكەین، ئیدی لە ڕووی بارودۆخە بە پێچو پەناكاندا ناوەستینەوەو دڵی خۆمان لەسەر هەستی درۆینەی ڕەزامەندی، دادەمەزرێنین.

د.تاریق سوەیدانیش دەڵێت: (زۆربەی خەڵكی، چاوەڕێی شتێك دەكەن، تا بگۆڕێن.. بڕێكیشیان، تا كۆسپو نسكۆیەك ڕایان نەچڵەكێنێت، یان ئەركەكانیان لە ژیندا نەگۆڕێت، ناگۆڕێن.. بەڵام ئەو گۆڕانكارییەی لە ویستی سەربەستو هەستی بەرپرسیارێتییەوە هەڵدەقوڵێت، مەزنترین گۆڕانكارییە.)

دەسا كە تۆ بەبێ جموجوڵ، لە جێی خۆتدا ڕاوەستاویتو تەماشای ژینی خۆت دەكەیت، لەولاشەوە كەسانی دیكە بەرەو پێش دەچنو خەونەكانیان بەدی دەهێنن، ئەوا هەرگیز مەڵێ: من بەختەوەرم، چونكە كەموكورتی ژینمان، دەسكاری خۆمانە.. هەر بۆ خۆشمان، ئەو دۆخە جێگیرو چەسپاوەمان هەڵبژاردووەو بڕیاری گۆڕانكاریو دەرچوون لە قەفەزی دیلیو ڕووكردنە ناو خۆشیی ژینیشمان، كردووە بە قۆچی قوربانی.. كەواتە لەمڕۆوە، چ ژینێك بۆ خۆت هەڵدەبژێریت؟!

سەرچاوە: خمسة عوامل لحیاة ناجحة: توم ردل، خلاصات: ٣٤٥، علاقات: ٥٤

# ئەدیسۆن داهێنەرێکی دەگمەن

ئا: ناصح خالد

(تۆماس ئەلفا ئەدیسۆن)ی داهێنەر، لە ساڵی (١٨٤٧) لە شاری (میلان) لە ویلایەتی (ئۆهایۆ)ی ئەمریکی لە دایکبووە.

(ئەدیسۆن) بەوە دەناسرێتەوە کە تەنیا (٣) مانگ لە قوتابخانەی حکومی خوێندویەتی، چونکە سەرپەرشتیاری قوتابخانەکە بە منداڵێکی کاڵفامو کەم عەقڵو کەم توانای دادەنا، بۆیە هەر زوو لە قوتابخانە دووردەکەوێتەوە.

ژیانی زانستیی و داهێنەرانەی (ئەدیسۆن)، لەو کاتەدا دەستیپێکرد کە خەریکی فرۆشتنی ڕۆژنامە بوو لە وێستگەیەکی شەمەندەفەر، کاتێك کە سەرنجی ڕۆژنامەکانی دەداو چۆنییەتی چاپکردنیان سەرنجی ڕاکێشا، بۆیە دەستیکرد بە فێربوونی نهێنی ئەم کارەو ساڵی (١٨٦٢) هەڵسا بە دەرکردنی بڵاوکراوەیەکی هەفتانە.

هەموو داهێنانەکانی (ئەدیسۆن) بە هۆی (ماری) دایکییەوە بوو، (ماری) نموونەیەکی جوانی ئەو دایکەیە کە خۆی هەڵدەستێت بە پەروەردەو فێرکردنی کوڕەکەی. (ئەدیسۆن) لەبارەی دایکییەوە دەڵێت: (دایکم بوو کە منی بنیاتنا، چونکە ڕێزی دەگرتمو متمانەی پێمهەبوو، هەستی وای بۆ دروستکردبووم، کە من گرنگترین کەسم لە بووندا، بۆیە پەیمانم داوە کە هەرگیز سەرشۆڕی نەکەم، هەروەکو چۆن ئەو هەرگیز منی سەرشۆڕ نەکردووە).

(ئەدیسۆن) لە ژیانیدا دوو جار ژنی هێناوەو خێزانی یەکەمی کۆچی دوایی دەکات، پاشان خێزانی دووەم پێکدەهێنێت، لە هەر یەکێکیشیان (٣) منداڵی هەبووە.

بلیمەتیی (ئەدیسۆن) لە بواری داهێناندا، هەر لە تەمەنی منداڵییەوە دەرکەوت، لە (٨٤) ساڵەی تەمەنیشیدا جگە لە (گڵۆپی کارەبایی) چەندین داهێنانی تریشی هەبووە، وەکو: تۆمارکەری دەنگ، واتا (مسجل)، مایکرۆفۆنو لە دوادوایی ژیانیشی وێنەی جوڵاوی قسەکەریشی داهێنا. بۆیە (ئەدیسۆن) لە ژیانی خۆیدا زیاتر لە هەزار داهێنانی بە ناوی خۆی تۆمارکردووە.

(ئەدیسۆن) سەرەتا لە وێستگەیەکی شەمەندەفەر وەکو فەرمانبەری ناردنی (بروسکەنامە) کاری دەکرد، کە ئەمەش یارمەتیدا بۆ داهێنانی یەکەم ئامێری تەلەگرافی کە بەشێوەی (خودکار) نامەی دەنارد، ساڵی (١٨٧٦) تاقیگەیەکی دامەزراندو جۆرە ئامێرێکی بروسکەناردنی داهێنا، کە دەیتوانی بە یەك هێڵ چەندین بروسکە بنێرێت. پاشان (کرامافۆن)ی داهێنا کە هەڵدەستێت بە تۆمارکردنی دەنگ لەسەر پەپکەیەکی کانزایی. دوو ساڵ دوای ئەمەش هەڵسا بە داهێنانە گەورەکەی کە ئەویش (گڵۆپی کارەبایی) بوو. ساڵی (١٨٨٧) هەڵسا بە داهێنانی ئامێری (کینیتۆسکۆب) کە یەکەم ئامێر بوو بۆ ئیشپێکردنی فیلم. هەروەکو پاتری خەزنکردنیشی داهێنا. ساڵی (١٩١٣)ش یەکەم فیلمی سینەمایی دەنگیی داهێنا. بە هۆی ئەم هەموو داهێنانەیەوە (ئەدیسۆن) لە لایەن کۆمەڵەی شانشینی بەریتانی بۆ هونەر، خەڵاتی (ئەلبێرت)ی پێبەخشرا، هەروەها کۆنگرێسی ئەمریکی ساڵی (١٩٢٨) مەدالیای زێڕینی پێبەخشی.



ئەوەی تێبینی دەکرێت لە ژیانی ئەدیسۆن ئەو هەموو تاقیکردنەوانەو سووربوونەیەتی لە سەر گەیشتن بە ئامانجی کارەکانی، ئەوەتا خۆی دەڵێت: سەد ڕێگام دۆزییەوە کە نەبوونە هۆی داهێنانی پاتری، (نۆ هەزارو نۆ سەدو نەوەدو نۆ) جاریش هەوڵمدا بۆ دروستکردنی گڵۆپی کارەبایی. (ئەدیسۆن) ساڵی (١٩٣١)ماڵئاوایی لە ژیان دەکات. ئەمەش بەشێکە لە وتەکانی (ئەدیسۆن)ی داهێنەر:

- من هیچ یەکێك لە داهێنانەکانم بە ڕێکەوت دانەهێناوە، بەڵکو بە کارێکی پڕ لە ماندووبوون.
- من لەو شوێنەوە دەستپێدەکەم، کە دوایین کەس تێیدا کۆتاییهێناوە.
- ئەگەر هەموو ئەو شتانە بکەین کە ئێمە توانامان بەسەریدا هەیە، ئەوا خۆمان تووشی سەرسوڕمان دەکرد.
- زۆرێك لە شکستەکانی ژیان، هی ئەو کەسانەن کە دەرکیان بەوە نەکردووە، چەندە لە گەیشتن بە سەرکەوتن نزیکن.
- ئەگەر شتێك بەو شێوەیە کاری نەکرد کە تۆ دەتەوێت مانای ئەوە نییە ئەو شتە سوودی نییە.
- بلیمەتی بەم شێوەیەیە: ١٪ ئیلهامو بۆ هاتن ، ٩٩٪ ئارەقڕشتن.
- من شانازی بەوەوە دەکەم کە چەکم دانەهێناوە.
- من تووشی شکست نەهاتووم، بەڵکو (١٠) هەزار ڕێگەم دۆزییەوە کە کارناکەن.
- هەردەم ڕێگەیەکی دیکە هەیە، کە باشترە.
- هیچ بەدیلێك نییە، بۆ کارکردنی دڵسۆزانەو جیددیانە.
- ئێمە لە هەر شتێکدا یەك لە ملیۆنیش نازانین.
- هیوا گەورەکان، مرۆڤە گەورەکان دروستدەکەن.

# باشترین کاتی خەوتن!




گەر شەوانە بە ئاسوودەیی سەردەکەیتە سەر سەرینەکەتو پاش ماوەیەکی کەم خەو دەتباتەوە، ئەوا بزانە تۆ مرۆڤێکی زۆر بەختەوەری، دەزانیت چەندان کەس هەیە لەم ژینەدا شەو تا بەیانی ئەم دیووئەودیوو دەکات، بەڵام بۆ ساتێکیش چاوەکانی ناچێتە خەو؟

کەواتە نیعمەتەکانی خودا بە کەم مەزانە، لە بەرامبەردا سوپاسی خودا بکە، بۆ هەموو ئەو نیعمەتانەی پێی بەخشیویت.

هەمووان دەزانین خەو بۆ ژیانی مرۆڤ چەندە گرنگە، ئەم توێژینەوەیە باس لە باشترین کاتەکانی خەوتن دەکاتو بەراوردی کاتژمێری خەوتنی شەو دەکات بە کاتەکانی دیکە، بێگومان لە مێژە مرۆڤ درکی بەوە کردووە کە هیچ کات خەوی ڕۆژ ناتوانێت جێگەی خەوی شەو بگرێتەوە.

یەکێك لەو خاڵە نێگەتیڤانەی ئێستا لە نێو کۆمەڵگەی کوردیدا باوە، فەرامۆشکردنی باشترین کاتەکانی خەوە، هەربۆیە لەم بابەتەدا باس لە باشترین کاتەکانی خەوتن دەکەین، بەو هیوایەی هەمووان بتوانین باشترین کات هەڵبژێرین بۆ خەوتنو پشوودان بە مێشكو جەستەمان..

**١- خەوتن لە کاتژمێر (٩)ی شەو تا کاتژمێر (١٢) نیوەشەو:** هەر کاتژمێرێك خەو لەم کاتەدا، بەرامبەر بە (٣) کاتژمێر خەوە لە کاتەکانی دیکەدا.

**٢- خەوتن لە کاتژمێر (١٢)ی شەو، تا کاتژمێر (٣)ی شەو:** هەر کاتژمێرێکی بەرامبەر یەك کاتژمێرو نیوی خەوتنە، لە کاتەکانی دیکەدا، جگە لە خاڵی یەکەم.

**٣- خەوتن لە کاتژمێر (٣)ی شەو تا کاتژمێر (٥)ی بەیانی:** هەر کاتژمێرێکی بەرامبەر تەنها یەك کاتژمێر خەوتنە، جگە لە کاتەکانی خاڵی یەکەم و دووەم.

هەروەها توێژینەوەکە ئاماژە بەوە دەکات، ئەگەر مرۆڤ چووە سەر جێگەی نووستنو توانی لە کاتژمێر (١٠)ی شەو تا کاتژمێر (٤)ی بەیانی بخەوێت، ئەوا وەکو ئەوە وایە (١١ تا ١٢) کاتژمێر پشوویدابێت.

بە پێی وتەی شارەزایانو لێکۆڵەرەوان، هەستان لە خەو پێش خۆرهەڵاتن، دەبێتە هۆی تەمەن درێژیو باشبوونی تەندروستی مرۆڤو وریاییو چالاکی، بەشێوەیەکی گشتی تەندروستی مرۆڤ بەهێز دەکات، بەڵام درەنگ هەستان لەخەو، واتە دوای خۆرهەڵاتن، مرۆڤ تەممەڵ دەکاتو بیروهۆشو لەشی دادەگیرێ، کەواتە باشترین بڕیار ئەوەیە کە زوو بخەویتو زووش لە خەو هەستیت. هەروەها پسپۆران ئامۆژگاریمان دەکەن کە تێکرای خەوتن لە شەوو ڕۆژێکدا ٧ بۆ ٩ کاتژمێرە.

**خەوی تەندروست دەبێت سێ سیفەتی تێدابێت:**

یەکەم: حەوانەوەی جەستە.

دووەم: حەوانەوە لە ڕووی سۆزدارییەوە.

سێیەم: حەوانەوەی بیروهزر.

خەوی ئاساییش تەنها لە کاتژمێرەکانی شەودایە، جگە لە خەوتنێکی کەم لە پێش نیوەڕواندا، کە بە (قیلولە) ناسراوە.

**زیانەکانی خەوی زۆر:**

ڕەنگە هەندێك کەس کاتێك دەبیستن دەڵێین، خەو زیانی هەیە، بە لایانەوە سەیر بێت، لە ڕاستیدا هەروەکو چۆن مرۆڤ ناتوانێت بەبێ خواردن بژی، بەڵام زیادەڕۆیی کردن لە خواردندا، دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە تەندروستی مرۆڤ، بە هەمان شێوە زیادەڕۆیی کردنیش لە خەوتندا دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە تەندروستی مرۆڤ، بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین: زیادەڕۆیی لە هەر شتێکدا مرۆڤ دووچاری جۆرەها نەخۆشیو نارەحەتی دەکات.

ئاشکرایە کە خەو چەندە سوودبەخشە بۆ مرۆڤ، هەرگیز مرۆڤ ناتوانێت دەستبەرداری بێت، مرۆڤ لەوپەڕی شەکەتیو ماندوویێتیدا بە چەند کاتژمێرێك خەو، ماندوێتی دەردەچێتو هەست بە پشوودانو حەوانەوە دەکات.

هەندێك کەس پێیان وایە، هەرچەندە زیاتر بخەویت، زیاتر هەست بە ئارامیو حەوانەوە دەکەیت، بەڵام ئەمە بۆچوونێکی هەڵەیە، لێکۆڵینەوە زانستییەکان ئەوەیان سەلماندووە کە خەوتنی زۆرو لە ڕادەبەدەر، دەبێتە هۆی تووشبوونی مرۆڤ بە جۆرەها نەخۆشی ترسناك، بە تایبەت نەخۆشییەکانی دڵو مێشك... مرۆڤ چەند زیادەڕەویی لە خەوتندا بکات، ئەوەندە زیاتر هەست بە لەش قورسیو تەممەڵی دەکات، کاتێکیش لە خەو هەڵدەستێت لە بری ئەوەی هەست بە پشوودانو حەوانەوە بکات، زیاتر هەست بە ماندووبوونو بێتاقەتی دەکات.

خاڵێکی دیکەی نەرێنی لە نەریتی خەوتندا ئەوەیە کە لە ناو ئێمەدا باوە، ڕاستەوخۆ دوای نانخواردن دەخەوین، بە تایبەت لە نیوەڕواندا، ئەمجۆرە خەوە مرۆڤ زیاتر قەڵەو دەکات..

بە هیوای خەوێکی ئارام و ئاسوودە..

پەری شێخ کەریم





# خەمۆکی لە نێوان هاوسەراندا



نەخۆشی خەمۆکی یەکێکە لەو نەخۆشییە کوشندانەی کە ڕووبەڕووی مرۆڤەکان دەبێتەوە، چ ئافرەت بێت، یا پیاو، یاخود لاوان، کاریگەرییەکی گەورەی هەیە لەسەر ژیانیان، دەروونناسان بە کارەساتێکی گەورەی دەژمێرن بۆ کۆمەڵگا، لەسەرژمێرییەکاندا دەرکەوتووە لە دوای نەخۆشی دڵو کارەساتی ڕێگاوبان، نەخۆشی خەمۆکی بەسێیەم هۆکار دەژمێردرێت بۆ لە ناوچوونی مرۆڤ، واتە مردنی کتوپڕ.

ئاساییە مرۆڤ بە هۆی ڕووداوێکی ناخۆشەوە، یا مردنی ئازیزێکییەوە، بۆ ماوەیەك خەموپەژارە دایبگرێو لە گۆشەی خەمباریدا کەنار بگرێت، بەڵام خەمۆکی دیاردەیەکی جیاوازەو نەخۆشییەکی درێژخایەنە، سنوری خەمی سروشتی دەبەزێنێتو وا لە خاوەنەکەی دەکات هیچ حەزو ئارەزوویەکی لە ژیان نەمێنێتو ڕەشبینانە بڕوانێتە ژیانو زۆرجار وای لێ دێت کە حەزنەکات تەنانەت قسەش بکات.

دەروونناسان ڕوونیان کردووەتەوە بە شێوەیەکی گشتی ئافرەتان زیاتر دووچاری ئەم نەخۆشییە دەبن، تا پیاوان، چ پێش هاوسەرگیری بێت، یا پاش، وەك پێویست گۆشەکەمان باس لە خێزان دەکات بە پشتیوانی خوا، ئێمەش باس لە پاش هاوسەرگیری دەکەین، تا بتوانین لەم گۆشە خنجیلانەدا کۆمەڵێك ڕێنماییو چارەسەرکردن بۆ ئێوەی بەڕێز ڕوون بکەینەوە.

کاتێك یەکێك لە هاوسەران ڕووبەڕووی ئەم نەخۆشییە دەبێتەوە، ژیانی هاوسەرێتی تووشی نارەحەتی دەبێت، بە تایبەتی ئەگەر کەسی بەرامبەر، وەك پێویست نەیتوانی یارمەتی دەربێت لەو نەهامەتییو نەخۆشییە ڕزگاری بکات، بێگومان چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشییە بە ئارامگرتنو دڵسۆزی و خۆشەویستی نواندن دەگۆڕێت، پاشان پرسیارکردن لە کەسانی دەروونناسو پزیشکی شارەزا لەو بوارەدا بەبێ ئاگاداربوونی نەخۆش.

**دیاردەکانی خەمۆکی چەند خاڵێکن:**

١. بێ هیوایی، ڕەشبینی، بێزاریی.
٢. ڕووگرژیو تووڕەییو بێتاقەتی.
٣. داماوی، ماندوێتی ڕووخسار.
٤. نیگەرانیو دڵەڕاوکێ.
٥- خراپبوونی باری دەروونی.
٦. لە دەستدانی کەسێتی.
٧-سستبوونی چالاکیو جووڵەی ڕۆژانە.
٨-نەمانی ئارەزوو لەخواردنو خواردنەوە.
٩. بیرکردنەوە لە خۆکوشتن، یا ئازاردانی دەوروبەر.
١٠. ئازاری پشتو سەرئێشەو بێ میزاجی.
١١- شەونخوونیو خەوزڕان.

ئەم نەخۆشییە زۆرە بەردەوام بەرەو زیادبوون دەچێت، ئەمەش بە هۆی ئاڵۆزبوونی ژیانو بێئارامییەوە، لە گرنگترین هۆکارەکان بۆ زیادبوونی خەمۆکی، ئەمەش یا باردۆخی تایبەتییە، واتە ئەو کەسە کێشەیەکی تایبەتی هەیە، بە هۆی نەتوانینی بۆچارەسەرکردنی، کێشەکە زاڵبووە بەسەر دەروونیدا، یا بە هۆی مردنی کەسێکی خۆشەویستەوە، وەك لە سەرەتادا باسمان کرد، یاسەرنەکەوتنی لەکارو بوارێکدا، واتە کێشەیەکی نێو خێزانەکەی، یادەرەوەی خێزانەکەی، بەپێی جیاوازی خەمەکان جۆری خەمۆکیش دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

١- خەمۆکی کاتی.
٢- خەمۆکی وەرزی.
٣- خەمۆکی بەردەوام.

**١- خەمۆکی کاتی:** دکتۆرە خەدیجە هلالی شارەزا لە دەروونناسیدا، دەڵێت: ئەم جۆرە ئافرەتان زیاتر ڕووبەڕووی دەبنەوە هەتا پیاوان، ئافرەت بە هۆی تێکچوونی هۆرمۆناتەوە لە کاتی سووڕی مانگانەو کاتی سکپڕیدا، پاشان منداڵبوون کاردەکاتە سەر لایەنی دەروونیان، هەر بۆیە ناو براوە بە خەمۆکی کاتی، چونکە بە گەڕانەوەی باردۆخەکە نەخۆشییەکەش باش دەبێت، پاشان هۆکارێکی تر بۆ زیاتر دروستبوونی لە لای ئافرەت بە هۆی بوونیەتییەوە کە هەست ناسکو زۆر زوو بیردەکاتەوە لە شتەکان، بە کەمترین شت تووشی خەمۆکی دەبێت.

**٢- خەمۆکی وەرزی:** زۆر کەس بە پێی وەرزەکان باردۆخی دەگۆڕێت، هەست بە بێزاری، ئارەزوو نەبوون لە کارکردن، نەمانی ئارەزوو لە خواردنو نووستن، ئەم جۆرەیان ناوبراوە بە خەمۆکی وەرزی، چونکە بە تەواوبوونی ئەو وەرزە ئەو کەسە دەگەڕێتەوە سەر بارودۆخی ئاسایی، بەڵام ئامۆژگاریمان بۆ ئەو کەسانەی تووشی خەمۆکی وەرزی بوون، تا نەخۆشییەکە زاڵتر نەبێت بەسەریاندا کاتێك دڵتەنگ بوون، یادی خودا بکەن، بێگومان بە دڵێکی فراوانەوە پشتو پەنات بە خوا هەبێت، خەمەکانت لە بیر دەچێتەوە کاتی گونجاو برەخسێنە بۆ چوونەدەرەوە، یان سەردانی کەسو کار.

**٣- خەمۆکی بەردەوام:** ئەم جۆرەیان دادەنرێت بە نەخۆشییەکی ترسناك، هێندە زاڵدەبێت بە سەریدا کە بەشێوەیەکی گشتی ئەو کەسە دەگۆڕێت، چ لە قسەو چ لە کرداردا، ئەم کەسە هەمیشە هەست بە بێزاریو تووڕەبوون دەکات، حەز بە

تەنیایـــیو قسـەنەکردن لەگەڵ کەسـانی دەوروبـەردا دەکات، ئـارەزوو نەکردن لە جێبەجێکردنی کاری ڕۆژانە، هەستنەکردن بە خۆشـییەکانی ژیانو هەموو شـتەکان بـە ئاڵـۆزی دێتە پێش چـاو، لاوازبوونی لایەنی ڕۆمانسیو جنسی، تەنانەت زۆرجار حـەز بە بینینی هاوسـەرەکەی ناکات، یا بە پێچەوانەوە هاوسـەر حەز بە بینینی خێزانەکـەی نـاکات، کـەم دەخەوێـتو هەمیشە دەگری.

خۆشەویسـتان هەموو ئەم شـێوازانە ڕووبەڕووی کەسـی (خەمـۆك) دەبێتەوە، ئەوەی لێرەدا پێویسـتە باسـی بکەم، ئایا ئەرکـی کەسـی بەرامبەر چییـە بۆ ئەم نەخـۆشو نائومێـدە؟ ئایا تەنهـا ئەرکی ژیانی هاوسەرێتی ئەوەیە لە خۆشییەکاندا پێکەوە بنو لە ناخۆشیو نەخۆشیدا پشت لـە یەکتـری هەڵکـەن؟ کەسـی نەخۆش سەرزەنشـت بکرێت بە ناتەواوو نەخۆشو لە دەستچوو ناو ببرێت؟!!

## چۆن خۆمان لە خەمۆکی بپارێزین؟

١- کەسـی نەخـۆش ڕێنمایی بکرێت، ڕۆژانـە بـە خوێندنـەوەی قورئـان، یان گوێگرتنی، چونکە دڵ ئاسـوودە دەبێت بە بیستنی وتەکانی خودا.

٢- ڕێنماییکردنی بە زیاتر نزیکبوونەوە لە خودا بە نوێژکردنو یادی خودا، کەسێك یـادی پەروەردگار بـکات، پەروەردگاریش یادی دەکات.

٣- ڕێنمایی کردنـی بە خوێندنەوەی کتێب، بە تایبەتی چیرۆكو نووکتە.

٤- باسکردنی ئەو شتانەی لایەنی ئیمانی زیاد دەکات، وەك باوەڕبوون بە قەزاوقەدەر، کە هەموو خۆشیو ناخۆشییەك بە ویستی خودایە، پەروەدگار مرۆڤ تاقیدەکاتەوە لە ژیاندا تاچەند سوپاسـی خـودا دەکات لە خۆشیو ناخۆشیدا.

چارەسـەرکردنی نەخـۆش بـە شـێوازی ژیـری، لـە لایەن کەسـانی لێزانو دەروونناسەوە:

* شـێوازی گفتوگـۆ کردن، سـەرەتا زانینی کێشەکە، پاشان دەبێت بە شێوەیەك قسـەی لەگەڵدا بکرێت، کـە ببێتە مایەی دڵخۆشکردنی.

* هەمیشە هانی بدات بۆ جێبەجێکردنی کارو پیشەیەك، تا سەرقاڵبێت بە کارێکەوە بە تەنها دانەنیشێت.

* سەردانکردنی دۆستانو خۆشەویستانو تێکەڵاوی لەگەڵ هاوڕێی باشدا.

هەرشادو بێبەڵابن!

# ژیان فێری کردم



**ژیـان فێری کردم:** ئامانجێکی ڕوونم بۆ ژیـان هەبێت، چونکە ژیان چەند سـاتێکە بێگومان هەر پێی دەگەیت.

**ژیان فێری کردم:** هەرگیز لە بڕیارداندا پەلـە نەکـەم، چونکـە زۆرجـار ڕواڵـەت هەڵخەڵەتێنەرە.

**ژیان فێری کـردم:** ئەگەر بۆ یەکەمجار بـە کەسـێك گەیشـتم، بـە پێـی ڕواڵەتی هەڵسـەنگاندنی بۆ نەکەم، پێویستە مۆڵەتی پـێ بدەم با بێتە گۆو قسـە بکات، ئەو کات بە پێی عەقڵی هەڵیسەنگێنم.

**ژیـان فێـری کـردم:** هەمـوو ئـەو هەنگاوانەی کە بۆ پێشەوە ناومە، سەرژمێری بکـەم، چونکە ئەگەر تەنها یـەك هەنگاوم لێتێکبچێت، ئەوا بۆ دواوە دەگەڕێمەوە.

**ژیـان فێری کردم:** ئەگەر لە شـێنەییو کاتی ئاسـاییدا خواپەرست بم، خوای گەورە لە نارەحەتیو تەنگانەدا بە هانامەوە دێت!

**ژیـان فێری کـردم:** گرنگترین شـت لەم ژیانـەدا بریتییـە لـە باوەڕبـوون بـە خوای گەورەو هەوڵدان بۆئەوەی لە ڕێگەی پەرستنو گوێڕایەڵی فەرمانەکانییەوە، لێی نزك بیتەوە.

**ژیان فێری کردم:** هیچ کات بۆ ڕابردوو نەڕوانـم، چونکـە ڕۆژگارەکانـی ڕابـردوو کۆتاییـان هاتـووەو هەرگیـز ناگەڕێنەوە، بەڵکـو بۆ ئاینده بڕوانـم، کە پڕە لە هیواو ئاواتو گەشبینی.

**ژیان فێـری کـردم:** دووربکەومەوە لە ئیرەیـیو گومان بردن، چونکـە بنەمای لە ناوبردنی ژیانن!

**ژیـان فێری کـردم:** هەرگیز مشـتومڕ لەگـەڵ کەسـانی کـەم فامدا نەکـەم، چونکە پەشـیمان دەبمەوە، هەروەها لەگەڵ کەسـانی نەزانیشدا مشـتومڕ نەکەم، چونکە ماندووم دەکات، لەگـەڵ درۆزنیشـدا نەژیـم، چونکـە ئەدۆڕێم!

**ژیـان فێری کـردم:** لەبەردەم دۆسـتو دوژمنـدا زەردەخەنـە بکـەم، یەکەمیـان دڵخـۆشو خۆشـحاڵ دەبێت، دووەمیشـیان فێردەکات تا بیربکاتەوە!

**ژیـان فێری کردم:** جوانی ڕاسـتەقینە، بریتییە لە جوانی ئاکارو ڕەوشتبەرزی، نەك جوانی ڕووخسار!

**ژیان فێری کردم:** بەختەوەری ڕاستەقینە بریتییە لە: خۆبەکەمزانینو شانازیکردن بە کەسوکارو خوشكو براو دۆستانتەوە.

**ژیـان فێری کـردم:** لە کۆتاییـدا هەر ڕاستی سەردەکەوێت!

**ژیـان فێری کردم:** سـەرکەوتن ئاسـان نییـە، ئەگەر پێی گەیشـتی، پارێزگاری لێ بکە، بۆئـەوەی بۆنی گوڵ بکەیت، نابێت لە دڕك بترسیت!

**ژیان فێـری کردم:** متمانـەم بە خۆمو تواناکانـم هەبێـت، تـا کەسـانی دیکـەش متمانەم پێ بکەن.

**ژیان فێری کردم:** خێزانو کەسوکار، وەکو ئـەو درەختە وان کـە لقوپۆپی زۆرە، هیچ کام لە لقەکان مەبـڕە، بەردەوام پارێزگاری لەو درەختە بکە، ئاوی بدەو گرنگی پێ بدە، بۆئەوەی گەورە بێتو گەشە بکاتو بەردەوام سـەوزو جـوان بێت، ئەمەش بە سـەردانو هەواڵ پرسینو بە دەمەوە چوونیان دەبێت، کەواتە بـەردەوام پەیوەندییـان پێوە بکەو هیچ کات دەنگیان لێ دامەبڕە!

شاگوڵ عوسمان حسێن

# خێزانەکان شایەنی باشترینن



ئەی خودایە چۆن بتوانم ئەم خێزانە کۆبکەمەوە، چۆن بتوانم خاڵ بە خاڵ دەست پێبکەمەوەو لە نێو ڕیزی ئەو خاڵانەدا ژیان بگەڕێنمـــەوە کە لە بەهەشـــتەوە هاتوون، ئەی خودایە چی بکەم بۆ خاڵی هاوبەشـــی خێزانەکان، لە چیدا بڵێم ئێوە وەك یەکن؟ ئێوە بەخشـــراون، ئێوە پێش ئەوەی بێنە سەرزەمین ماڵتان لە بەهەشتدا بووە، بۆ وا خۆتان سەرقاڵ دەکەنەوە بە دنیاوە؟

بـــۆ وادڵـــەکان بریندار ئەکـــەن؟ ئەی خودایە چۆن بتوانـــم بڵێم ئێمە لە پێناو دڵسۆزێك کۆکراوینەتەوە، لە پێناو ژیانێك مردنمان بیرچۆتەوە، لە پێناو خۆشییەك یەکترمـــان جێهێشـــتووە، پێـــش ئـــەوەی جیاببینەوە ئێمە خوشكو برابووین، پێش ئەوەی نامۆ بین بە یەکتری ئێمە ئاشـــنای نێـــوان دوو مـــرۆڤ بووین، ئـــەی خودایە زۆرمان پێویست بە خاڵی نێوان خۆمو زۆر شت، تەنانەت خۆشم هەیە!

ئاخۆ خاڵی هاوبەشی نێوان خۆم، هەر گۆڕین بێت، یان هەرتێرکردن بێت، هێندە پێویســـتە بۆ ئەم پێداویســـتیانەی نێوان مردنو ژیـــان عەقڵمان لە بیرکەین، ئەی خودایە ئەی نێوان منو زمانم تەنها لۆمەو سەرزەنشـــتی بەرامبەرەکەم بێت، تەنها لە بیـــری خۆمدا بم، تەنهـــا خاڵ تۆڵە بێت؟ نێوان ئێمـــەو خودا، تەنها نزایە بۆ خۆمو جێبەجێکاری داواکارییەکانی من بێت نەك لە پێشـــدا فەرمانەکانی خودا بێت، نێوان منو ڕۆژگاری داهاتووم لە کوێدایە؟ ئێستاو ڕابـــردوو هەمووی هـــەر داخو بێ ئومێدی بێت، ئەی نێوان منو خۆشەویســـتی تەنها کات کوشتن بێت، ئەی خودایە نێوان منو خێزان دەبێت چی بێت؟

ماڵـــەکان چۆڵکـــراون، خێزانـــەکان چاوەڕێـــی یەکیـــان بـــەلاوە زۆرە! خودایە ئارامی سەری خۆی هەڵگرتووە، هەموومان لە پێناو پشـــکی باشتر، چارەی ئەوانی تر بـــە زمانێك ڕەش دەکەین، بە کردەوەیەك لە ناویان دەبەین.

ئەی خودایە، نێوان منو پارەو سامانەکەم دەبێـــت چی بێت؟ نفســـی، نفســـی، منیشـــی گرتۆتەوە؟ تەنها ئەوەی هەبێت دەبێت هەرمن بێت، چـــی لەم هەموو من منە بکەم؟ فێرمان بکە، یارمەتیمان بدە، تا بتوانین خاڵی هاوبەش پێکەوەنێیـــن، تا چەند خاڵێـــك کۆبکەینەوەو سنورێك بکێشین لەو سنوورەدا ماڵێك هەبێت پڕبێـــت لـــە قبوڵکردنی یەکتـــری، بە هەموو کەموکوڕییەکانمانەوە یەکترمان خۆشـــبووێت، ئەم جوگرافیایە پێویستی بە دەوڵەتێك دەبێت پڕبێـــت لە دڵنیایـــی، پڕبێت لە ســـەروەریی، پڕبێت لە خۆشبەختی بۆ یەکتریی.

ئەی خودایە کاتێك هاتینە ســـەرزەوی (پێکەوە لە بەهەشتدابووین، پێکەوە هاتینە خـــوارەوە، پێکەوە خودا لێمان خۆشـــبوو، پێکەوە نێرراین بۆسەرزەوی) پێمان خۆشە پێکـــەوە بچینەوە بۆ نیشـــتمانێك کە چڵو پۆپەکەی لـــەم دونیایەدایـــەو ڕەگەکەی وا لە بەهەشـــتدایە، ژیانمان سنورێکی هەبوو، بـــە بەرنامە ئێمـــەت ڕەوانە کـــرد، لە لای تۆوە هاتووین بـــۆ لای تۆش دەگەڕێینەوە، خێزانەکان زۆر تێکشکاون، هەرشەوان دادێت ماڵەکان چۆڵن، نازانم سودی ماڵ چییە بۆ خێزان، تۆ بڵێی ئەو ماڵە لەبەر جلەکانمان بێت، تـــا کەنتۆرەکان بێ جـــل نەبن؟ یان لەبـــەر نووســـتنێك بێت تـــا ئوتێلەکان بێ پرخـــە نەبن! یان لە بەر ســـفرەو خوانێك بێت تا ڕێستورانتەکان بێ ژەم نەبن! لەبەر ڕووخسارمانە تا هەتاو نەمان سوتێنێ!

ئەی خودایـــە، بۆ خاڵێکی هاوبەش بۆ نێو خێزانەکانمان، هێنـــدە لەگەڵ تی.ڤی. یەکان یـــەك دەگرینـــەوە، هێنـــدە لەگەڵ ئەندامانـــی خێزاندا نیـــن، هاواریش کەن خێزانـــەکان بێ گوێـــن لە ئاســـت یەکتر، هێندە خەریکی خوێندنەوەی شـــتی ترین، لـــە ئاســـت ماڵـــەوە نەخوێندەوارین، هەر یەکـــە لە پاڵ ســـوچێکی ژووری خۆیدا، لە ماڵەکاندا بە خەیاڵێ گوزەر دەکەین، کەچی هێشتا لە دەرەوە نەگەڕاوینەتەوە!

ئەی خودایە، کوڕە لاوەکانمان گیرۆدەی دەستی تیرهاوێژێکی بێ ویژدانن، بابەگیان کەمێك لە ئاشـــنایی خۆتم پـــێ بدە، کچە لاوەکانمان گیرۆدەی دەســـتی بەلەمێکی بێ ســـەوڵن، دایە گیان فێری ســـۆزێکم بکە تا

سنوورەکان لەیەك جیابکەمەوە، خێزان دەستی لێ بەردراوە، کەچی هەمووی ئازار دەچێژێت بۆ هێندە نەشارەزان بەرامبەر کەسێتی منداڵەکان؟ بۆچی هەموومان وەك یەکەم منداڵ دەخەنە ڕوو؟

ئەی خودایە، بە تەمەنە بەڕێزەکان ماندوون بەدەست ئەم هەموو گوریسەی کە نازانن لە کوێدا بچڕاوەو گرێدراوە بە تاڵێکی ترەوە، لە چی بپرسم؟ گەر چەند بێ دەنگتریش بم، دڵم هیچ نەدرکێنێ خۆ چاوەکانم جێی لێوەکانمی گرتۆتەوە بۆ خۆی دەدوێ، براکەم، خوشکەکەم، دایە، بابە، ژەمێك باتێربین لە خۆشەویستی ئێوە، شەوێك بنووین بە دڵنیاییەوە، ڕۆژێك پێکەوە بژین، تکایە دوور مەکەونەوە، با (سیلەی ڕەحمەکانمان تەنها سیلەی لەحم نەبێت)، باگەڕانەوەمان بۆماڵەوە ناچاری نەبێت، بەڵکو پێویستییەکی پڕ لە نەزاهەت بێت، بیرتە کە منداڵ بووین کاتێ یاریمان دەکرد هەر لێوەکانمان پێکەنین بوو، گۆیمان دەزرنگایەوە لە پێکەنینی یەکتر، دڵتەنگییەکانمان چەند زوو بیردەچووەوە، کەسمان ژیانی ئەوی ترمان زەوت نەدەکرد، بەڵکو پارێزگاریمان دەکرد، چونکە هێندە پەیوەست بووین بە یەکترییەوە، خۆشییەکان زۆربوون، گرەوەکانی ژیانمان هەمووی دەبردەوە، نەشمان دەزانی چی دەخۆین، کەچی ئێستا دەزانین چی دەخۆین، بەڵام نازانین ڕەفتار بکەین لەگەڵ یەك، هەموو یارییەکانمان بیرچۆتەوە، ناخۆشییەکان کۆمان دەکاتەوە، چاومان یەکتر نابینێت، گیرفانەکان جێی هەموو شتێکی گرتۆتەوە، کەسمان براوە نیین؟! بیرتانە دایەو بابە، تەباییەکانمان لە کوێ داناوە؟ دەستخۆشییەکانمان لە بیرچووە!

هەموو ڕاوێژکاری بە توانایین لە نێو ژیانی ئەوانی تر، بەڵام توانای تیماری برینی سەردڵی خێزانی خۆمانمان نییە، دایەو بابە فێرمان بکەن نەك ڕێگەمان لێ بگرن بۆ نەکردنی کارێك، بۆ هێندە دوور لە یەکتر دەژین، لە خێزانەکانی ئێمەدا شەڕەکان بە ئاشکرا دەکرێت، بیری ئێمەیان نییە! بەنهێنیش ئاشت دەبنەوە هەربیری ئێمەیان نییە! نازانین لە نێوان ئەم ئاشکراو نهێنییەدا چۆن ئێمە خۆمان دەکرۆشینو قورسترین وانە جێ دەهێڵن بۆمان، کە هەرگیز لێی تێناگەین، ئەویش چۆن داوای لێبوردن بکەین؟ چۆن ببورین؟ ببورە بابەو دایە زیاتر لە چارەنوسێکی تر ئێمە پێویستمان پێتانە، دایەو بابەگیان ڕۆژیکی خۆش بوو، یەکەم دەوڵەت دروست دەبێت (ڕازیبوون بە یەکتری) دەوڵەت ڕادەگەیەنرێت، (ئاهەنگتان دەگێڕا) سەربەخۆیی تاکەکان بڕیاردرا (ماڵێك ئاوەدان دەبێتەوە)، ئامانجو پلانێك هەیە، سبەی دەبینە خاوەن پەرلەمان (خێزانێك دروست دەبێت)، پێویستمان بە شورایەك دەبێت (پارێزگاری لە یەکتربکەین) هێزێ هەبێت بۆ بەرگری (ئێرە کە ماڵەکانە، یەکەمین هەرچییەکی تر هەبێت) وەزارەتمان دەوێت بۆ فێربوون، ئەمە پێناسەی دەوڵەتی خێزانە (سبەی هەر ئەم تاکی خێزانە دەوڵەت بەڕێوە دەبەن)، ئەم خاڵە هاوبەشانە بۆچی ترازاون لە یەکتری کەسمان یەکتر ناناسینەوەو توانای دەنگمان نییە بۆ یەکتری.

کاتێك دەمخەنە ژێر پرسیارێك، کە منداڵ بووین هەر لێرەدا فێری وانەی جیاوازیم دەکەن (بابەت خۆشدەوێ، یان دایە؟) گەر وتم: بابە، دایەگیان پێمخۆشە تۆش بڵێی: منیش بابەگیانتم خۆشدەوێت، گەر وتم: دایە، بابەگیان پێمخۆشە تۆش بڵێی: منیش دایەگیانتم خۆشدەوێت...

زۆرسوپاس بۆ ئەو مامۆستا بەڕێزەی کە جوانترین وانەی فێرکردم)، کاتێ ئیختیارێك بۆ منداڵەکان دەکەین نازانین چۆن ئەو ئیختیارە بکەین، چونکە هیچ پرۆگرامێکمان لە بەردەستدا نییەو دەسەڵاتەکان دیارکراو نییەو نازانرێ خاڵی هاوبەشی نێوان دایەو بابە چییە؟

نازانین خاڵی هاوبەشی نێوان باوكو کچەکان، کوڕەکان چییە؟ بە پێچەوانەوە، تۆ بڵێی: هەر بریتی بێت لە فەرمانی بابەو جێبەجێکردنی لە لایەن ڕۆڵەکانەوە؟

گەر پرسیارم لێ بکرێت کە بەشێکە لە سەربەستیمو هەڵبژاردنم پێدەدەیت، ئەوا بواری بیرکردنەوەم دەدەیتێ، بەڵام گەر فەرمان بکەیت بەسەرماندا ئەوا هەموو سنوورەکان بە ڕوومدا دادەخەیت؟

خاڵی هاوبەشی نێوان دایكو کچەکان، یان کوڕەکان چییە؟ بە پێچەوانەوە چییە؟ تۆبڵێی هەربریتی بێت لە پێدانی دەسەڵاتی چێشتلێنانو کاروباری ناوماڵ بۆ کچەکانو کوڕەکان؟ بۆچی دایکەکان بوون بە خزمەتکار؟ وەك خزمەتکار مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین! باوکمان وەك کرێکارێك، ئێمە هیچ هەوڵێك نادەین ئەوان هەموو خزمەتێکیان پێخۆشە کە ئێمە داوای دەکەین، بەڵام دەبێت ئێمەش وەفایەك لە خزمەتی ئەوان بکێشین، بە چاو، یان بە لێو، یان گەر هەرنەبوو بە ئارامی، بینینی ڕووخساری ئەوان بە چاوەکانی ئێمە پڕە لە پەرستن، دایەو بابە ئێوە بڕیارتان داوە بە بەخشندەیی هەردوو جیهانان، تەنها پشت ببەستنو ئەویش بپەرستن، لەسەر ڕێگای ڕاست یەکترتان قبوڵ کردووە، لە نێو گەورەترین نیعمەتدا خۆتان لە توڕەیی بە دوورگرن، ماوەیەکمان پێ بدەن، ئێمە جیهان لە ئێوەوە دەناسین!

بابە گیان چ کارێکت دەوێت، منیش دەتوانم یارمەتیت بدەم، خودا لێمان وەردەگرێت هاوشێوەی پێغەمبەر ئیبراهیمو پێغەمبەر ئیسماعیل (سەلامی خوایان لێ بێت)، ئەی دایە گیان چ بەڵێنێکت بە خودا داوە تا نەزرەکەت قبوڵ بێت، هاوشێوەی خاتوو مەریەمو دایکی (سەلامی خوایان لێ بێت)، بامنیش بە وەفابم بەرامبەر بەڵێنەکەی تۆ بە خودا، پێش هاتنم لە دنیا دایەو بابەگیان نییەتی کارێکی باشترم پێ بدەن، با هەروا ژیان گوزەرنەکەم. هەروەك لە ئامۆژگارییەکانی لوقمانی حەکیم بۆ کوڕەکەی هاتووە، ئەوەی خۆی دەیکرد ئەوەی کرد بە وەسیەت، دایە گیان دەزانم گەر تینومبێت صەفواو مەروەم بۆ دەکەیت، لە پێناو قومێك ئاو بۆ من.

منیش بەڵێن دەدەم گەر داوای مەرگیشم لێ بکەیت دایەگیان، بابەگیان لە پێناو بڕیاری تۆدا لەگەڵ خودا، چەند جوانە ئەم خاڵە هاوبەشە، دایە بە دوای ژیان دەگەڕێت بۆی گەر لە قومێك ئاودابێت، کەچی بابەگیان لە پێناو بەڵێنو فەرمانی خودا ژیانێکی تری دەداتێ، من دەمەوێت لە کەشتییەکە لەگەڵ تۆدا سەرکەوم، ئەو دەمەی دەستەکانم پەنجەیەکی تۆ دەگرێتو یەکەم هەنگاو، هەنگاو دەنێم ژیانێکی تر دەدەم بە تۆ، خۆشحاڵییەکی تر بە ژیان دەهێنیتە ئارا بۆمان، تکایە جێم مەهێڵە، دەمەوێت لەگەڵ خێزانەکەمدابم، منو براکەم، منو خوشکەکەم، بۆ دامەزراوەیەك کاربکەین، کە دەمانەوێت حەق بێژ بین، هاوشێوەی هارونو موسی (سەلامی خوایان لێ بێت)، کۆتا وەسیەت ئەوەیە ئاگاداری خێزانەکەتان بن، باشترینتان ئەو کەسەیە کە لەگەڵ خێزانەکانتان باش مامەڵە دەکەن، هاوشێوەی پێشەواکەم، خودایە، یارمەتیمان بدەو لێمان خۆشبە، پێویستمان بە یەکتری هەیە خودایە، هەموو خێزانەکان بە ختەوەربکە، کۆمان بکەرەوە لە ژێر سێبەری خۆشەویستی خۆتدا، فێرمان بکە خێزانەکان پێش هەموو شتێکە بۆمان!

بێگەرد فارس



# ئافرەت وەك درەخت وایە.. تۆ لە كامیانی؟!

*** درەختی باشو بەڕێزو بەخشندەو ڕەسەن:** ڕەگەكانی پتەوو چڵەكانی جوانو بەرەكەی پڕ بەرەكەتەو گوڵەكانی ڕازاوەو پڕن، بە جۆرێك بەرامبەر ناڕەحەتییەكان دەوەستێتەوەو ڕێگە نادات بە زریانەكانی خراپەو ڕقو كینەو ئیرەیی ڕەگە باشو پتەوەكانی بێهێز بكات!

ئەوەش ئافرەتی ڕەسەنە كە ئارەزووەكانی كەسانی تر نای هەژێنن.

*** درەختی ئارامگرو قوربانیدەر:** چاوەڕێی بارانێك دەكات بە خۆشەویستییەوە، ژووانی بە خۆشییەوە بەسەردەباتو بەرەكانی زۆر باشەو ئارام دەگرێت لەسەر برسێتیو تینوێتی، لەگەڵ ئەوەشدا سیس نابێتو شیرینترین شەماڵ پەخش دەكاتەوە، ئەوەش ئافرەتێكی زۆر بەڕێزە، پەند وەرگرو پێزانە، ئامۆژگارییەكانی دەكاتە دیاری بێئەوەی هیچ هەستێك بریندار بكاتو ئازاری بدات!

*** درەختی نەرمو جوان:** چڵەكانی هێندە نەرمن شنەی شەماڵ گەمەیان لەگەڵدا دەكات، گوڵەكانی جوانن، باڵندەكان بە غەزەلەوە دەخوێنن، سەوزییەكەی، گەڵا نەرمەكانی، هەركەسێك سەیری دەكات دەیكاتە دیلی خۆی، ڕوانینەكانی بەشەرمانەیە، هێندەی تر جوانی دەكات! ئەمەش ئەو ئافرەتە جوانەیە كە بە حەیاو خۆبەكەمزانینەوە ڕازاوەتەوە.

*** درەختی میزاجی:** تاوێك پڕ بەرهەمو تاوێكیش سیسو لاوازە، گوڵەكانی دەكرێنەوە لەبەر هۆیەكی دیاریكراو، جوانییەكەی دەشارێتەوەو بەرەكانیش نادیار دەبن، سەرەڕای خودپەسەندی ئەو، لەگەڵ ئەوەشدا خۆشەویستانی بیری دەكەن، بەردەوام نوێ دەبێتەوەو لە كاتیش سڵ ناكاتەوە، بەڵكو هەمیشە بەشی خۆی بۆ حەوانەوەی وەردەگرێت، ئەوەش ئافرەتێكی زیرەكە هەمیشە لەگەڵ بەرەو پێشچوونی تەمەن پارێزگاری لە جوانی خۆی دەكات!

*** درەختی كەڕ، بەڵام بەختەوەر:** ئەو درەختەیە كە گوێی لە دەنگی بای بەهێز نییە، لە مەترسی بروسكەكان ناترسێو گوێ بەوە نادات تەمەن چڵەكانی لاوازو بێهێز بكات! ئەو هەمیشە جوانەو شانازی بە خۆیەوە دەكات.

ئەوە ئافرەتێكی بەهێزە گوێ بە قسەو ڕەخنەكانی كەسانی تر نادات، هەمیشە لە ڕەزامەندیو بەختەوەریدا دەژی.

*** درەختی هەوڵدەر:** بێزار نابێتو خۆی بە دەستەوە نادات، زۆر بەهێزەو هەرگیز ڕازی نابێت بە مانەوەی لە یەك شوێندا بەبێ جوڵان، بەڵكو هەڵدەگەڕێو هاتووچۆ دەكات، بۆ نەهێشتنی هەموو ئەوەی لە بەردەمیدا دەیبینێ، جوانییەكەی تاو تاو زیاد دەبێتو كەسانی تر سەرسام دەكات بە هەڵوێستیو بەهێزی سووربوونو بەردەوامی سیمای ئەوە.

ئەمەش ئافرەتێكی داهێنەرەو بە بەرەنگاربوونەوەی ڕازاوەتەوە!

*** درەختی هەڵخەڵەتێنەرو دوو ڕوو:** لە شێوەدا جوانە، بە بۆنە خۆشەكەی دیلو مەستت دەكات، چڵ و پۆپەكانی نەرمو گوڵەكانی جوانو ڕازاوەن، بەڵام ژەهراوین هەركەسێك لێی نزیك بێتەوە دەیكوژێت! ئەوە ئافرەتێكی درۆزنو هەڵخەڵەتێنەرە، بە جوانییەكەی دەتخاتە ژێر سایەو سێبەری خۆی، بەڵام بە هۆی كردارە پڕ فێڵو ناباشەكانی لە بیر خۆێت دەباتەوە!

بەرزان ئەبوبەکر



# خەم تەنها شتێکە کە مرۆڤ لەناودەبات

پاشای وڵاتێك، بە دەست نەخۆشی قەڵەوی‌و چەوری‌و گۆشتی زۆرو کێشی زیادەی لەشییەوە دەیناڵاند، بۆ ئەم مەبەستە سەرجەم پزیشك‌و حەکیمەکانی بۆ کۆشکی پاشایەتی بانگهێشت کرد، تا چارەسەرێکی بۆ بدۆزنەوەو کەمێك لەو چەوری‌و قەڵەوییەی کەم بکەنەوە، بەڵام هەر ڕێگەیەکیان بۆ دادەنا، بە هۆی پارێزنەکردن‌و نەوسنی جەنابی پادشاوەو ڕەچاونەکردنی ئامۆژگاری پزیشکەکان نەیان دەتوانی سەرکەوتووبن...

ڕۆژێکیان پیاوێکی ژیرو دانا هات بۆ کۆشکی پاشاو پێی گوت: جەنابی پاشا، بە پشتیوانی خودا من دەتوانم چارەسەری کێشەکەتان بکەم، پاشا بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر شادمان بوو، دانای ژیر وتی: من شارەزای زانستی ئەستێرە ناسیم، سەرەتا دەمەوێت ڕێگەم بدەیت تا ئەمشەو سەیرێکی ئەستێرەکانی ئاسمان بکەم، بۆئەوەی بزانم چ دەرمانێك بۆ دەردەکەی بەڕێزتان دەگونجێت.

بۆ ڕۆژی دوایی دانای ژیر گەڕایەوە بۆ لای پاشاو پێی گوت: بەپێی ئەو ئەستێرەیەی من ئەمشەو سەیرم کرد، بەداخەوە تەمەنی بەڕێزتان لە ژیاندا تەنها یەك مانگی ماوە، ئیدی ئەگەر دەتەوێت دەوایەك بەکاردەهێنم بۆ چارەسەری گرفتەکەت؟

ئەگەریش دەتەوێت لە ڕاستی قسەکەی من دڵنیا بیت، ئەوا دەتوانیت ئەو ماوەیە لای خۆت زیندانیم بکەیت، ئەگەر بۆچوونەکەم ڕاست دەرچوو، ئەوا فەرمان بدە دوای کۆچی دوایی‌و ماڵئاوایی بەڕێزتان ئازاد بکرێم، ئەگەریش بە پێچەوانەوە بوو، ئەوا دەتوانیت بە دەستی خۆت تۆڵەم لێ بسەنیت.

پاشا بە لێکدانەوەکەی زۆر نیگەران بوو، فەرمانی دا دەستگیری بکەن، لەو ڕۆژە بەدواوە پاشا خۆی لە خەڵکی داڕنی‌و بە تەنها لە ژوورێکدا بە خەمباری ژیانی دەگوزەراند، قسەی لەگەڵ هیچ کەسدا نەدەکردو ڕێگەی نەدەدا کەس بێتە سەردانی جگە لە هاوسەرەکەی! هەر ڕۆژێك بەسەریدا تێدەپەڕی خەم‌وپەژارەی زیادی دەکرد، چونکە قسەی داناکە زۆر کاری تێکردبوو، چاوەڕوانی مەرگی دەکرد.. چاوەڕوانی زۆرناخۆشە، ئەی ئەگەر ئەو چاوەڕوانییە چاوەڕوانی هاتنی مەرگ بێت، دەبێت چۆن بێت؟

پاشا لە چاوەڕوانی مەرگداو لە خەمی هاتنی ئەو ڕۆژەدا زۆر لاواز بوو، چەوری جەستەی بە جارێك توایەوە، گۆشتی زیادەی نەما، کێشی زۆر دابەزی، بەمجۆرە بیستوهەشت ڕۆژ تێپەڕی!

لەو ڕۆژەدا پاشا ئارامی لێبڕاو خەم‌وپەژارەکەی یەکجار زیادی کرد، ناردی بە دوای داناکەداو پێی گوت: هەواڵێکی تازەت لانییە؟

دانای ژیر کاتێك پاشای بینی بە تەواوی لاواز بووەو کێشی دابەزیوەو لە نەخۆشی قەڵەوی ڕزگاری بووە، بە ئارامی وەڵامی دایەوە: جەنابی پاشا لە ڕاستیدا من زۆر لەوە کەمترم کە شارەزای زانستی نادیارو ئاینده بم، زانینی ئاینده تەنها لە دەسەڵاتی خوای گەورەدایە، سوێند بە خوا من نازانم خۆم کەی تەمەنم کۆتایی دێت‌و ئەم دنیایە جێدەهێڵم، چ جای ئەوەی بزانم تۆ کەی تەمەنت کۆتایی دێت!

بەڵام هیچ دەوایەکم چاکتر شك نەبرد بۆ دەردەکەی بەڕێزتان، جگە لە خەم‌و پەژارە، هیچ ڕێگەیەکی تریشم نەدەزانی کە بتوانم وابکەم تۆ خەم بخۆیت، جگە لەم ڕێگەیە! کاتێك پاشا زانی ئەمە پلانێك بووە بۆ چارەسەری دەردەکەی، ئیدی لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات!!

بەڕاستی خەم‌وپەژارە، چەوری دەتوێنێتەوە، کێش دادەبەزێنێ‌و کێو لە بن دێنێت! هەربۆیە پێشەوا (سەلامی خوای لێبێت) لە نزاکانیدا دەیفەرموو: (اللهم إني أعوذ بك من الهم والحزن... خودایە پەنات پێدەگرم لە خەم‌وپەژارە....)

ئێستا با پێکەوە وردبینەوە، کارەکانی خوای کردگار چەندە جوانە! ئەگەر مرۆڤ بیزانیایە کەی کۆتا ڕۆژی ژیانییەتی، چی ڕووی دەدا؟ خەم‌وپەژارە بۆ هەمیشە دەبووە میوانی‌و بەردەوام لە بیری ئەو ڕۆژە دیاریکراوەدا دەبوو کە کۆتا ڕۆژی ژیانییەتی! پاکوبێگەردی بۆ ئەو خودایەی مرۆڤی بەشێوەیەك دروستکردووە کە نازانێت کەی بۆدواجار ماڵئاوایی لە ژیان دەکات!!

# گەشەسەندنی زمان‌و قسەکردن لە منداڵدا



ن: د. کیمبرلی پۆویل
و: بەهادین بەهرام

**چەند هۆکارو نیشانەو پێشنیارێك بۆ گرفتەکانی سەرەتای قسەکردن لە منداڵەکەتدا:**

قسەکردن ئەو شارەزایی‌و کارامەییەیە کە منداڵان هەوڵی گەشەسەندن‌و بەرەوپێشبردنی دەدەن لەگەڵ یەکەم دەربڕینی دەنگو وشەکانیان لە کاتی ساواییاندا. زۆربەی منداڵان، وشە سەرەتاییەکانیان پێکهاتووە لە دەنگی سادەو ساکاری وەك (بابە، دادە، بەی بای...). ئینجا بەرەبەرە منداڵان شارەزاییەکانیان وەگەڕدەخەن بۆ قسەکردن، یان دەنگ دەربڕین بۆ مەبەستی دروستکردن‌و پێکهێنانی زمان. زمانیش ئاماژەیە بۆ بەکارهێنانی وشەو ڕستە، بۆ گەیاندن‌و ئاڵوگۆڕی بیرۆکەکان لە نێوان مرۆڤەکاندا. کاتێك کە منداڵان دەست دەکەن بە پەرەپێدان بەرەو زمانێکی ئاڵۆزتر، ئیتر وشەی درێژتر دروست دەکەن کە پێویستی بە کۆنترۆڵ‌و بزوێنەرێکی باشتر هەیە. ئەو کاتیش ئامادە دەبن بۆ قوتابخانە، زۆر لە منداڵان بەشێوەیەك قسە دەکەن کە کەسێکی بێگانەش دەتوانێت بە ئاسانی لێیان تێبگات. بە هەرحاڵ، هەندێك لە منداڵانیش زۆرتریان پێدەچێت تاوەکو بتوانیت هەرچی دەیڵێت لێی تێبگەیت. ئەم قسەکردنانە، یاخود ئەم دواکەوتنی زمانە لە چەندین هۆکارەوە ڕوودەدەن.

**هۆکارەکانی دواکەوتنی زمان:**

بە گوێرەی لێدوانەکانی دکتۆرە (الیزابیت پراسر) کە دەڵێت: (دەستنیشانکردن‌و دۆزینەوەی هۆکاری ڕاستو تەواو بۆ گرفتی قسەکردن لە منداڵەکەت، زۆر زەحمەتە. کاریگەریی‌و توانای قسەکردنی هەر منداڵێك بە چەند هۆکارێکەوە بەندە، لەوانە: توانای بیستن لە منداڵدا، گەشەی فسیۆلۆژی ئەندامەکانی ناو دەم‌و قوڕگ، هەروەها تواناو چالاکی بۆماوەیی)).

**ئەمانەش چەند هۆکارێکی زۆر باون سەبارەت بە دواکەوتنی زمان:**

**١- لە دەستدانی توانای بیستن:** منداڵان لە ڕێگەی بیستنەوە لە کەسانی دەوروبەرەوە، فێری قسەکردن دەبن. بۆیە کاتێك نەخۆشییەکانی گوێ، یاخود کێشەو گرفتی تری تایبەت بە گوێ، تووشی منداڵان دەبێت، ئەوا ناتوانن بەشێوەیەکی ڕاستو دروست قسە ببیستن، بەم هۆیەشەوە ناتوانن بەڕاستو دروستی فێری قسەکردن ببن. بۆ نموونە، وشەو دەنگی وەك (کات) (هات) (لات) لەوانەیە هەمان دەنگی هەبێت لە لایەن منداڵی تووش بووەوە، واتە بە یەك دەنگ دەیانبیستێت. تەمەنی نێوان (١٢) مانگ تا (٤) ساڵ، پەرەسەندنی زمان لە لوتکەدایە، واتە گرنگترین‌و هەستیارترین ماوەیە لە تەمەنی منداڵدا بۆ پەرەپێدانی زمان، جا بۆیە نەخۆشییەکانی گوێ لەم ماوەیەدا، کاریگەری دەبێت لەسەر قسەکردن‌و زمان.

**٢- دواکەوتنی زمان:** منداڵان بە زەحمەت فێری مانای وشەکان دەبن، هەروەها چۆنییەتی بەکارهێنان‌و دانانی وشەکانیش لە ڕستەدا. جا دواکەوتنی فێربوون کاریگەری دەبێت لەسەر وەرگرتنی زمان.

**٣- بۆماوەزانی:** ئەمە دیاردەیەکی باوە، بەڵام هەمیشەیی نییە، مەرج نییە هەموو خێزانێك تووشی ببێت. بەڵام یەکێك، یان هەردوو لە دایكو باوکەکان، یان هەریەکێك لە کەس‌و کار، لەوانەیە لە منداڵیدا گرفتی قسەکردنیان هەبووبێت. بە هەرحاڵ، مەرج نییە ئەو منداڵانەی کە گەشەی قسەکردنیان هێواشە، دایكو باوکیشیان هەمان کێشەو گرفتیان هەبووبێت.

**٤- خووگرتن بە قسەکردنی ناڕێكو هەڵە:** کاتێك منداڵان دەست دەکەن بە قسەکردن، هەندێ وشە بە هەڵە دەردەبڕن. ئەگەر هاتوو منداڵێك قسەیەکی هەڵە بە بەردەوامی دووبارە بکاتەوە، ئەوا هەر بەم شێوەیە خووی پێوە دەگرێتو هەرواش فێر دەبێت. بۆ نموونە، منداڵێك لە جیاتی بڵێت: (وەرمگرت)، بڵێ: (وەگرتم)، یان لە جیاتی بڵێ: (مەکتەب) بڵێ: (مەتکەب)، ئەگەر ئەم هەڵەیەی بۆ ڕاست نەکرایەوە، ئەوا خووی پێوەدەگرێتو لەسەری ڕادێت.

ئەمانە لە دیارترین هۆکارەکانی دواکەوتنی زمان بوون. پزیشك دەتوانێت

یارمەتیت بدات لە دیاریکردنی حاڵەتەکە ئەگەر هاتوو دواکەوتنەکە بە هۆی هۆکاری جەستەیی، یان هەر شتێکی دیکەوە بێت.

**نیشانەو قۆناغەکانی قسەکردن:**

بەشێوەیەکی گشتی چەند نیشانەو پێوەرێك هەن سەبارەت بە قسەکردنی منداڵو شارەزایی زمانیان، ئەگەر هاتوو لە تەمەنی سەروو یەك ساڵییەوە نەیتوانی قسە بکات، یان قسەکانیان روون نەبوو، یاخود وشەو زمانەکە جیاواز بوو بە بەراورد لەگەڵ منداڵەکانی تری هاوتەمەنی خۆیان. سەرەڕای ئەوەی کە سەردانی پزیشك، یان دکتۆرێکی تایبەت بە چارەسەری گرفتی قسەکردن، دەبێت دوایین بڕیارت بێت، بەڵام ئەم نیشانانەی خوارەوەش یارمەتیدەرن بۆ هەڵسەنگاندنێکی سەرەتایی منداڵەکەت.

**لە تەمەنی (٣) مانگی:** منداڵەکەت دەبێت دەست بکات بە دەرکردنی دەنگی بەرزو قیژە، ئەم قیژەیەش بە ئاوازێکی نزمو هێواشو دەنگێکی گڕوگاڵەی منداڵان کۆتایی دێت، یان جارجار بە نزمە گریانێكو نووزەیەك هێواش دەبێتەوە.

**لە تەمەنی (٦) مانگی:** منداڵەکەت سەیری ڕووخسارت دەکات کاتێك کە قسە دەکەیت، ئەویش هەوڵی ئەوە دەدات قسەت لەگەڵدا بکات، بۆیە هاوارو قیژە دەکاتو تەکان دەداتە خۆی، بە مەبەستی ئاگاداریو چاودێریکردن.

**لە تەمەنی (١) ساڵی:** منداڵەکەت توانای تێگەیشتنی هەندێ وشەی سادەو باوی هەیە، ئەگەر بێتو ئاماژەو دەست جوڵاندنی لەگەڵدا بێت، وەکو وشەی (بەی بای)و (وەرە)، هەروەها هەوڵ دەدات هەندێك وشەی وەکو (دادە)و (بابە)و (مەمە)ش بڵێت.

**لە تەمەنی (١٨) مانگی:** پێویستە منداڵەکەت لەم تەمەنەدا توانای تێگەیشتنی چەندەها وشەی هەمەجۆری هەبێت، هەروەها دەبێت چەند وشەیەکی تاکیش بەکاربهێنێت. دەبێت چەنەچەنێکی منالانەش بکاتو چەند قسەو پرسیارێکی کورتو سادەش بزانێت، وەکو (کوا لوتت؟)، (بمدەرێ)، (هەستە).

**لە تەمەنی (٢) ساڵی:** ئەو ڕستەو گرێیانەی منداڵەکەت بەکاری دێنێ، لە دوو، یان سێ وشە پێکهاتوون، وەکو (هی منە)، (من دێم)، (نۆرەی منە)، (هاتەوە.)، هەروەها منداڵەکەت دەتوانێت لە پرسیاری (باوکت، دایکت لە کوێیە؟) تێبگاتو هەندێ ئاراستەی وەك: (پێڵاوەکانت لە پێ بکە)، (چاکەتەکەت لەبەر بکە)ش بزانێت. تەمەن (٢) ساڵانەکان دەتوانن وشەی زیاتر تێبگەن لەوەی قسەی پێدەکەن. لەم تەمەنەدا، منداڵەکەت توانای تێگەیشتنی (٣٠٠) وشەی هەیە.

**لە تەمەنی (٣) ساڵی:** منداڵەکەت دەتوانێت لە هەندێ لە ئاراستەکانت تێبگات، وەکو (کاتی نووستنە) (ناوی خۆتی پێ بڵێ)... ئەگەر داوای لێ بکەین، دەتوانێت شتێك لەسەر، یان لە ژێر مێزەکە دابنێت. هەروەها توانای وەڵامدانەوەی هەیە لە بارەی شتەکانو ڕەنگەکان، وەکو (کامیان گەورەترە؟) (سپییەکەم بۆ بێنە). منداڵی (٣) ساڵان توانای تێگەیشتنی نزیکەی (٩٠٠) وشەی هەیەو نزیکەی (٢٠٠) وشەش بە ڕوونی دەردەبڕێت.

**لە تەمەنی (٤) ساڵی:** منداڵەکەت لەم تەمەنەدا دەتوانێت لە یەك کاتدا وەڵامی دوو ئاراستە بداتەوە، وەکو (کتێبەکە دابخەو بیدە بە من.) (دەرگاکە بکەوەو وەرە لام)... هەروەها ناوی تەواوی خۆی دەزانێو دەشتوانێت وەڵامی ڕستە هۆکاریو فیکرییەکان بزانێت، وەکو (ئەگەر سەرمامان بێ چی دەکەین؟) (ئەگەر خەومان بێت چی دەکەین؟) دەتوانێت ڕستە دروست بکات، وەکو (دوو کوڕ یاریان دەکرد)، (کچێك هاتە ماڵمان)، بەشێوەیەکی گشتی ڕستەکانیان (٤ — ٥) وشە درێژن.

لە (٤) ساڵیدا دەتوانن داواتان لێبکەن وەکو (پیلاوەکانم بۆ لە پێکە) (چام بۆ تێکە)، کۆمەڵە پرسیارێکی زۆر دەکەن. لەم تەمەنەدا دەتوانن نزیکەی (١٢٠٠ — ١٥٠٠) وشە تێبگەنو توانای بەکارهێنانی جێناوەکانی، وەك (من، تۆ، هی من، ئەوان، هی خۆمان....)یشیان هەیە.

**لە تەمەنی (٥) ساڵی:** لەم تەمەنەدا دەتوانێت لە یەك کاتدا سێ ئاراستە تێبگات، وەکو (قەڵەمەکەت بێنەو وێنەیەك بکێشەو بیدە بە من). هەموو پیتەکان بە وردیو دروستی گۆ دەکات، تەنها لەوانەیە پیتەکانی وەك (ڕ، س، ش، ز، ژ، پ) نەتوانێت. توانای وەسفکردنی شتەکانو ڕووداوەکانی هەیەو مانای وشەکانیش دەزانێت. ئاساییە کە منداڵی (٥) ساڵان توانای تێگەیشتنی نزیکەی (٢٥٠٠ — ٢٨٠٠) وشەی هەیەو دەشتوانێت ڕستەی (٥ — ٨) وشەیی بەکاربهێنێت. هەروەها دەتوانێت زیاتر لە (١٥٠٠ — ٢٠٠٠) وشە بەکاربهێنێتو بەسەرهاتی درێژیش بە وردی باس بکات.

**لە تەمەنی (٦) ساڵی:** ئێستا منداڵەکەت نزیکەی (١٣٠٠٠) وشە تێدەگاتو پێچەوانەکانیش دەزانێو دەتوانێت شتەکان بە گوێرەی ڕەنگو شێوەکانیان پۆلێن بکاتو بەکاریان بهێنێت، هەروەها هەموو ڕاناوەکان بە ڕاستو دروستی بەکاردێنێت.

**لە تەمەنی (٧) ساڵی:** منداڵەکەت دەتوانێت (٢٠٠٠٠ — ٢٦٠٠٠) وشە تێبگاتو ماوەو کاتو وەرزەکانی ساڵ لێك جیابکاتەوەو دەتوانێت ئاگاداری هەڵەی کاسانی تر بێت لە کاتی قسەکردنیان.

**چی دەکەیت بۆ بەرەوپێشبردنو باشکردنی زمانو قسەکردنی منداڵەکەت؟**

١- ڕاستگۆو دڵسۆزبە لەگەڵ منداڵەکەت، کاتێك تێناگەیت چی دەڵێت. وا پیشان مەدە کە تێدەگەیت بە وتنەوەی (باشە)، (ئێ) (تەواو)...هتد. بەڵکو هانی بدە، بەڵام نەك بە زۆر، کەوا قسەکە بە هێواشی دووبارە بکاتەوە بۆت. کاتێك کە تێگەیشتی ئینجا با ئەویش بزانێت کە ئەمە وای لێدەکات زمانەکەی بەرەبەرە باشترو پاراوتر بێت.

٢- هەوڵی ڕاستکردنەوەی هەڵەکانی بدە لە کاتی قسەکردنیدا. کاتێك کە منداڵەکەت هەڵەیەك لە قسەکردندا دەکات، بەشێوەیەکی ڕاستو دروست ئەو قسەیەی پێ دووبارە بکەوە، بێئەوەی بێزار بێت. منداڵان لە بیستنی قسەی ڕاستو بێ هەڵەی تۆ، فێری قسەکردنی بێ هەڵە دەبن.

٣- بۆ منداڵەکەت بخوێنەوە. چونکە بە هۆیەوە منداڵان بەرەبەرە وشەو دەنگی پیتەکان فێردەبن. ڕاهێنانو فێرکردنی منداڵ لەسەر چەندجارێك خوێندنەوەی هەمان کتێب، یان نامیلکە، دەبێتە هۆی دروستبوونی هۆگری ئاشنایەتی بە زمانەکەی.

٤- وا باشە ڕاوێژ بە کەسی پسپۆڕ لەو بوارەدا بکەیت، ئەگەر هاتوو زانیت کە گرفتێکی وا لە منداڵەکەت هەیە. پێویستە پزیشکەکەت ڕەوانەی لای کەسێکی تایبەتی ترت بکات لەو بوارەدا، ئەگەر حاڵەتەکە پێویستی بە هەڵسەنگاندنی زیاتر هەبوو. ئەگەر گرفتێك هەبوو، ئەوا ئەو ئاگادارکردنەوە سەرەتاییە، زۆر گرنگە. ئەگەریش هیچ گرفتێك نەبوو، ئەوا لە نیگەرانی دەحەسێیتەوە. بۆ هیچ منداڵێك زوو نییە بۆ یارمەتیدانی، زمانیش ئامرازێکی زۆر گرنگی ژیانە، کەواتە لە بیری منداڵەکەتدابەو بەردەوام زمانیو قسەکردنی هەڵسەنگێنەو یارمەتی بدە.

هێشتا هاوسەرگیریم نەکردووە



# ئەو کەسەی دڵی خۆی دەبەخشێت!

و: فیردەوس حەسەن

زۆر کەس هاتنە خوازبێنیم، بەڵام بە نەخێر وەڵامم دەدانەوە، تا ئەو کاتەی کوڕێك بە ناوی ئارش هاتە خوازبێنیم، هەرچی لە بارەیەوە پرسیارمان کرد، هەموو کەس بە کوڕێکی زۆرباش وەسفیان دەکرد، هەربۆیە خۆمو خانەوادەکەم رازیبووین، کە بێنە خوازبێنی، دوای ئەوەی لە بارەی هەموو شتێکەوە قسەکرا، تەنها یەك شت نەبێت کە بە نهێنی مایەوە، ئیدی چەند رۆژێك بوو دڵە خورپەم بوو، کە بابەتەکە بە ئارش بڵێم، یان نا، نەم دەویست هیچی لێ بشارمەوە، هەرچەندە هەندێك دەیانگوت: ئەگەر هیچ نەڵێی باشترە، بۆ دەتەوێت نیگەرانی بکەیت، دواتر بە ئارامی پێی بڵێ..

نا، ئەو کاتە ئیتر سودی نییە، نامەوێت بینای ژیانمان لەسەر درۆو ناراستی دروست ببێت، ئارش دەبێت راستییەکە بزانێتو بە خەیاڵێکی ئاسودەوە بڕیار بدات، راستە حەزم دەکرد راستییەکەی پێ بڵێم، بەڵام دەترسام پەشیمان بێتەوە لەوەی کە هاوسەرگیریم لەگەڵدا بکات، ئەوم لە نێوان چەندین خوازبێنیکاردا هەڵبژاردبوو، ناڵێم بێ کەموکوڕی بوو، بەڵام بە وتەی پێشینان گوڵ بێ درك نییە.

بەڵام باوکم دەترساو هەر ئەمڕۆو بەیانی دەکرد، دەیگووت: ئارش کوڕێکی باشە، بەڵام دەستی خاڵییە، ژیان لەگەڵ ئەودا کێشەی زۆرت بۆ دروست دەکات، کە بە دووری دەزانم بتوانیت تەحەمولی بکەیت.

ئارش دەیگوت: تانیا پەلە مەکە، بهێڵە با باوکت بە ئیسراحەت بیر بکاتەوەو لە ناخی دڵەوە رازیبێت.. چونکە ئەگەر وانەبێت ئەو کات هەرگیز دڵی بەرامبەر من باش نابێت!

ئارش کارمەندی کۆمپانیایەکی دەوڵەت بوو، موچەیەکی گونجاوی هەبوو، دوانیوەڕوانیش تەکسی دەکرد، تا بتوانێت ژیانێکی ئارام دابین بکات، خانەوادەکەی ئەو، منیان زۆر خۆشدەویست، هەرجارێك دەهاتن بۆ ماڵمان ئەوەندە بە قوربانو بە ساقەم دەبوون، کە ئەتووت چەندین ساڵە بووکیانم، من زۆر لەم بارودۆخە رازی نەبوومو حەزم دەکرد زوو زەماوەند لەگەڵ ئارش بکەم، تا چارەنوسم دیار بێت، ئەو راستگۆیانەو زۆر روون باسی ژیانی خۆی کردبوو، منیش هەروەها، تەنها یەك شتم لەگەڵ باس نەکردبوو، ئێستاش دوو دڵبووم کە بیڵێم، یان نا، ئەوەندەی کە ئارشم ناسیبوو دڵنیابووم کە کاردانەوەیەکی خراپی نابێتو لە خوازبێنییەکەی پەشیمان نابێتەوە، بەڵام لە راستیدا دەترسام خانەوادەکەی پەشیمانی بکەنەوە، زۆرم بیرکردەوەو لە کۆتاییدا گەیشتم بەو ئەنجامەی کە یەکەم هیچ شتێك وەك راستگۆیی نییە، دووەمیش مەرگ جارێکەو شیوەنیش جارێك، بۆیە بڕیارم دا خەیاڵی خۆم بۆ هەمیشە ئاسوودە بکەم.

ئارش دەمەوێت راستییەکت پێ بڵێم، سوێندت ئەدەم کە بە بێئەوەی لە روو دامێنیو بەزەیت بە مندا بێتەوە بڕیاری خۆت بدەیت، سوێندی خواردو کەمێك حەپەساو چاوەڕێ بوو تا قسەکەم بکەم:

من نەخۆشییەکی ترسناکم هەیەو..

قسەکەی پێ بڕیمو ڕەنگی زەردبوو، وتم: دڵم، تەنها بەشێکی کەمی دڵم کار دەکات، لە هەر ساتێکدا لەوانەیە بووەستێت،

لەسەرەی ڕوواندنی دڵدام، بەڵام لەوانەیە پێش ئەوەی سەرەم بگات...

ئیشارەتی کرد کە بێدەنگبم، فرمێسك لە چاوەکانیا قەتیس مابوو، بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: یانی چی؟ یانی هیچ دەرمانێکی تر نییە بۆ ئەوە؟

دکتۆرەکان دەڵێن تەنها بە ڕوواندنی دڵ چارەسەر دەکرێت، بە پەرێشانییەوە دەستەکانی لێك ئاڵاندو: برۆ بۆ هەندەران، دکتۆرەکانی ئەوێ..

وتم: نا، دکتۆرەکانی ئێرە لە ڕوواندنی دڵدا زۆر پێشکەوتوون، لە هەموو دنیادا کارەکانیان پەسەند دەکرێت، سەختترینو هەستیارترین نەشتەرگەری دڵ بە سەرکەوتویی لە وڵاتەکەماندا ئەنجام دەدرێت، تکادەکەم بە بێئەوەی بەزەییت بە مندا بێتەوە، ژیرانە بڕیار بدە، هیچی نەوتو ڕۆیشتو دوای کاتژمێرێك، تەلەفۆنی کردو وتی: تەنانەت ئەگەر بڕیار بێت تەنها یەك ڕۆژ لەگەڵ تۆدا بژیم، ئەوا بە خۆشحاڵییەوە ڕازیم، چ بگات بەوەی کە پشتیوانی خودا بە ڕوواندنی دڵ کێشەکەت چارەسەر بێت.

بە خانەوادەکەتت وتووە؟

ئەوان قسەیەکیان نییە، لەم کاتەدا بڕیار دەدەنە دەستی خۆم، تکایە هەوڵ بدە باوکت ڕازی بکەیت، تا هەرچی زووترە هەموو شتێك تەواو بکەین، قسەکانی ئەو دڵخۆشیان کردم، ئێستا ئیتر دەمتوانی پشتی پێببەستمو بە ئاینده ئومێدەواربم.. باوکم کاتێك زانی کە ئارش نەخۆشییەکەی منی زانیوەو لە هەمان کاتدا سورە لەسەرئەوەی کە زەماوەندم لەگەڵدا بکات، زەردەخەنەیەکی کردو وتی: حەزم کرد، بەڕاستی پیاوە!

باوکم لەو ڕستەیەیدا ڕازیبوونی خۆی ڕاگەیاندو ئارشیش بەڵێنی دا، کە هەرچی زووتر هەموو شتێکی زەماوەندەکە ئامادە بکات، بەڵام یەك هەفتەی مابوو بۆ زەماوەندەکەمان لە ناکاو دڵی من تووشی ئازارێکی زۆر هات.. کە چاوم کردەوە لە نەخۆشخانە خۆم بینییەوە، پەرستارەکە زەردەخەنەیەکی کردو وتی: حاڵت چۆنە؟ ئازارت نییە؟

نا باشی باشم، چەندێکە لە نەخۆشخانەم؟

- نزیکەی چوار ڕۆژ..

بەسەرسوڕمانەوە وتم: لە تەواوی ئەم ماوەیەدا من بێهۆش بووم؟

دکتۆرێکی بە تەمەن هاتە ژوورەوەو وەڵامی دامەوە: سوپاس بۆ خودا سەرکەوتوو بوویت، شانست هەبوو کە لەو کاتەدا دڵی کەسێکت بۆ ئامادە بوو، بەخۆشحاڵییەوە دەستم خستە سەر دڵمو وتم: یانی ئەم دڵە سەلامەتە؟

بەڵێ زۆریش سەلامەتە، لە مەودوا ئیتر کێشەت نابێت..

دوای کاتژمێرێك خانەوادەکەم گەیشتن، ماچیان کردمو: خۆشحاڵین کە خوا دووبارە تۆی بە ئێمە بەخشییەوە، بە هێواشی پرسیم: ئارشو خانەوادەکەی لە کوێن؟ دایکم فرمێسکەکانی سڕیو وتی: دێن، نیگەران مەبە، هەستم کرد شتێك ڕووی داوە، لە دڵی خۆمدا وتم: ئارش پەشیمان بووەتەوە!

سێ ڕۆژ دواتر، لە نەخۆشخانە دەرکرام، لە تەواوی ئەو ماوەیەدا خانەوادەی ئارش نەهاتن بۆ سەردانم، زوو زوو دەمپرسی: دایە، بۆچی خانەوادەی ئارش، یان خودی ئارش نایەن بۆ سەردانم؟

خەم مەخۆ کچم، دێن، ئەوان کەسانی باشن، هەر دێن!

دایکم بە خەمو گریانەوە ئەو قسانەی دەکرد، ڕۆژێك بە توڕەییەوە وتم: نارەحەت مەبە دایە، بە جەهەنەم کە نایەن، باش بوو کە ئارش ڕووی ڕاستەقینەی خۆی نیشاندا.

دوای ماوەیەك کەمێك حاڵم باشتر بوو، باوکو دایکو خوشکەکەی ئارش هاتن بۆ سەردانم، گوێم پێنەدانو بە ساردی مامەڵەم لەگەڵدا کردن، چاوەڕێبووم ئارشیشیان لەگەڵدا بێتو پیاوانە سەیری ناوچاوانم بکاتو بڵێت لە هاوسەرگیری لەگەڵ تۆدا پەشیمان بوومەتەوە، قسەی دڵم کردوو بە باوکیم وت: ئەم ڕەفتارانەی ئارش چ مانایەکی هەیە؟ بۆ خۆی دەشارێتەوە؟ دایکو خوشکەکەی دایانە پرمەی گریانو لای چەپی سنگیان ماچ کردم!

تووڕەبووم: ئەم کارانە مانای چییە؟ بۆچی دەگرین؟ دڵتان بۆ من دەسوتێت؟

باوکی ئارشیش دەستی کرد بە گریان، باوکو دایکیشم کەوتنە گریان، زۆر نیگەران بووم، ڕەنگم وەکو گەچ سپی بوو، کەسێك بە من دەڵێت چی بووە، یان نا؟

دایکی ئارش ڕووخساری ماچ کردمو وتی: ئارش ڕۆیشتو بۆ هەمیشە تەنهای کردین، ئەو دەعمی کرد..

هاوارم کرد: کەی؟ لە کوێ؟

دایکم وتی: هەر ئەو ڕۆژەی کە تۆ حاڵت خراپ بوو، بردمانیت بۆ نەخۆشخانە، ئارش دەعمی کردو مێشکی لە کارکەوت، دایکم هەر ئەگریاو نەیتوانی بەردەوام بێت، باوکی ئارش بە دەنگێکی لەرزۆکەوە وتی: پێشتر وەسیەتی کردبوو کە وەفاتی کرد بەشەکانی جەستەی ببەخشین بەو کەسانەی کە پێویستیانە، لەو کاتەدا کە زانیمان خەریکە دڵی تۆ لە کار دەکەوێت، باوکم نەیهێشت بەردەوام بێتو خۆی وتی: ئەم خانەوادەیە زۆر مرۆڤ دۆستن، ئەوان بە ویستی خۆیان دڵی ئارشیان کردە دیاری بۆ تۆو لە مەرگ ڕزگاریان کردیت!

دەستم خستە سەر لای چەپی سنگمو ورتە ورتم دەکرد: ئەمە دڵی ئارشە، بورامەوە، کاتێك هاتمەوە هۆش خۆم هەمووان لە دەورم بوون، هێشتا چاوەکانیان بارانی بوو، نەم دەزانی کاردانەوەم چی بێت، خۆشحاڵ بم، یان خەمبار!

باوکی ئارش میهرەبانانە سەیری کردمو وتی: کچی خۆم، خودا سەد ساڵ تەمەنت پێببەخشێت، خۆشبەخت بیت، کاتێك کە خانەوادەی ئارش ڕۆیشتن بە دایکمم وت: من لە دوای ئارش هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم!

دایکم دڵی دامەوەو وتی: ئاقڵ بە کچم، ئارش ڕۆیشتو ئیتر ناگەڕێتەوە..

بە گریانەوە وتم: چۆن دەتوانم بە دڵی (ئارش)ەوە کەسێکی ترم خۆش بووێت؟ نا دایە من هەرگیز هاوسەرگیری ناکەم، ئێستا شەش ساڵ بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوەو من هێشتا ڕازی نەبووم، جگە لە ئارش بیر لە هیچ پیاوێکی تر بکەمەوە!

**بیروڕای دەروونناسان سەبارەت بەم بابەتە:**

وەفاداری تانیا جێگای سەرنجو دەستخۆشییە، بەڵام ئەو دەبێت ڕاستەقینە قبوڵ بکات، بە دڵنیاییەوە ئارشیش ڕازی نییە کە ئەو ئازار بکێشێتو خۆی لە سروشتی ترین مافێك کە کچێك هەیەتی، واتە هاوسەرگیری، بێبەش بکات، دڵی ئارش کراوەتە دیاری بۆ تانیا، تا ئەو چەندین ساڵ بە سەلامەتی پێی بژێتو خۆشی لێ ببینێت، نەك ئەوەی کە وا بیر بکاتەوە ئەگەر هاوسەرگیری بکات، ڕۆحی ئارش ئازار دەدات، ئەو دەیەوێت وەفادار بێت، بەرامبەر بە ئارش، بەڵام ئەوە ڕێگاکەی نییە، تانیا دەتوانێت نوێژ بکاتو دوعا بۆ ئارش بکاتو داوای پاداشتی لە خوای میهرەبان بۆ بکات!

سەرچاوە: ڕوزهای زندگی



# بوك و زاوای سەرماڵ

مەرجی هاوسەرگیری یەکەمم، ئەوەبوو کە دەبێت لەگەڵ دایکمدا بژین، سەعید کە وەك خۆی دەیگوت: بۆ ئەوەی من ببمە هاوسەری، ئامادەیە هەموو مەرجەکانم قبوڵ بکات، لەبەرئەوە زۆر ئاسایی مەرجەکەمی وەرگرتو قبوڵی کرد، سەرەنجام لەگەڵ سەعید هاوسەرگیریم کرد، ژیانی هاوبەشی نێوانمان لە ژێر ساباتی ماڵە خنجیلانەکەی دایکمدا دەستیپێکرد، بەڵام هێشتا چەند هەفتەیەك بەسەر هاوسەرگیریماندا تێنەپەڕی بوو، ڕۆژێکیان سەعید وتی: شاناز گیان، من لە ماڵی دایکت ئاسوودە نیم، هەست بە نیگەرانی دەکەم!

-منیش زۆر بە توڕەیی بە ڕوویدا گوتم: مەگەر لە بیرت چووە کە ئەوە مەرجی یەکەمی پرۆسەی هاوسەرگیریمان بوو؟

-- نا لە بیرمە، بەڵام نەمدەزانی ئەوەندە سەختە!

- دایکم کە هیچ کارێکی بە تۆ نییە، ڕۆژانە سەرقاڵی ژیانو گوزەرانی خۆیەتی!

-- بۆچی من وتومە، دایکت کەسێکی خراپە؟!

- نەخێر، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە هاتیتە خوازبێنیم، ئەو مەرجەم پێ گوتی، جەنابت بێ سێو دوو قبوڵت کرد..

ئیدی لێرەوە ناکۆکییەکانی منو سەعید دەستیپێکرد، سەرەنجام هەموو شتێك لە قازانجی سەعید کۆتایی هات، چونکە شەڕو هەراو ناکۆکی نێوانمان، ئەوەندە پەرەی سەند، کە ناچاربووم داوای تەڵاق بکەم!

لە کۆتاییداو چەند مانگێك لە دوای پێکەوەژیانمان، منو سەعید بۆ هەمیشە لە یەکدی جیابووینەوە، جارێکی تر من ژیانم لەگەڵ دایکە ئەزیزەکەمدا دەستپێکردەوە، بەڵام پلانم دانا بۆئەوەی ئەگەر ئەمجارە هەرکەسێك هاتە خوازبێنیم، ژیان لەگەڵ دایکمدا لە گرێبەستەکەدا بنووسمو بە مەرجی سەرەکی دابنێم، چونکە من متمانەم بە خۆم هەبوو، دڵنیابووم کە بە پشتیوانی خودا دەتوانم بۆ جاری دووەم هاوسەرگیری بکەم، چونکە کورد وتەنی بە زاری خۆشم نەڵێم، کەسێکی ئاکار بەرزو ڕەوشت جوان بووم!

دوای چەند مانگێك ئیدی خوازبێنیکار دەهاتنو دەڕۆیشتن، بەڵام پێداگری لە ڕادەبەدەری من بۆئەوەی کە دەبێت لەگەڵ دایکمداو لە خانووە خنجیلانەکەی ئەودا بژیم، هەموو داخوازیکارەکانی پەشیمان دەکردەوە!

دایکم کە تێگەیشت مەسەلەکە ئەوە، ئامۆژگاریکردمو وتی: کچە ئازیزەکەم، من مناڵ نیم، لە ئاوو گڵ دروست بووم، کاتی ئەوە هاتووە کە تۆ لە بیری ژیانو گوزەرانو ئایندەی خۆتدا بیت..

قسەکانم پێبڕیو وتم: دایە گیان: هەرگیز ناتوانم بۆ ڕۆژێکیش لە تۆ دوور بکەومەوە، هاوسەر ئەمڕۆ نا، سبەی، هەر دەبێت، بەڵام دایکم لەم جیهانەدا تەنها کەسێکە، گەر لە دەستم بچێت، هەرگیز ناتوانم دەستیبخەمەوە!

شانازگیان، ئەم قسانەی تۆ پێکەنیناوین، ئەگەر تۆ سوور بیت لەسەر ئەو مەرجەت دە جاریش هاوسەرگیری بکەیت، سەرەنجام هەر شکست دەهێنیو چارەنووستان بە جیابوونەوە دەگات!

ئەگەر چی، وەڵامێکم نەبوو، بۆ قسە ڕاستو دروستو واقیعییەکانی دایکم، بەڵام بەردەوام هەوڵم دەدا بۆئەوەی قەناعەت بە دایکم بکەم.. یەك ساڵ بەسەر جیابوونەوەی منو سەعیددا تێپەڕی، بۆئەوەی بتوانم بژێوی خۆمو دایکم دابین بکەم، لە کۆمپانیایەك دەستم بە کارکردن کرد، نزیکەی هەشت مانگ بەسەر کارکردنم لەو کۆمپانیایە تێپەڕی، بەڕێوەبەری کۆمپانیاکە کە تەمەنی ٣١ ساڵ بوو، ناردییە خوازبێنیم، ئەو سەرەتا پرسیاری تەواوی ژیانی منی کردبوو، واتە لە بارەی منەوە هەموو شتێکی دەزانی، سەبارەت بە هۆکاری هەڵوەشانەوەی

هاوسەرگیری یەکەمیشم ئاگاداربووە، خاڵی هاوبەشی منو کامەران ئەوەبوو کە ئەویش لەگەڵ دایکە بەساڵاچووەکەیدا پێکەوە دەژیان، ئەویش وەکو من نەیدەتوانی دایکی جێبهێڵێت، هەربۆیە ئەو مەرجەی کە زۆر پێداگری لەسەر دەکرد، ئەوەبوو کە دەبێت لەگەڵ دایکیدا بژیمو ڕێزی لێبگرم، منیش کە پێشتر چەندین کەس هاتبوونە خوازبێنیم، بەڵام بە بیستنی ئەو مەرجەی کە دەبێت لەگەڵ دایکمو لەسەر ماڵی دایکم بژین، ڕێکنەدەکەوتین، ئەمجارەیان ڕاوێژم بە دایکم کرد، دایکم هەمان وەڵامی یەکەمجاری دایەوەو وتی: پێویستە لە بیری ئایندەی خۆتدا بیت، چیدی بە دیار منەوە دانەنیشیت، سوننەتی ژیان وەهایە، دەسەڵاتی تۆی تێدا نییە!

بەڵام نەمتوانی قەناعەت بە خۆم بکەم، کە دایکم جێبهێڵم، کاتێك ئەم وەڵامەم دایەوە بە کامەران، ئەویش وتی: دەتوانین پێکەوە ڕێگەچارەیەك دابنێینو چارەسەری گرفتی هەردووکمان بکەین!

بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: چۆن؟

وتی: بەو پێشنیارەی من گرفتی هەردووکمان چارەسەر دەبێتو لە ژێر ساباتی ماڵێکی خنجیلانەدا کۆدەبینەوەو دڵنیام دڵی دایکی هەردووکیشمان خۆشدەبێتو ڕازیش دەبن!

- باشە، پێشنیارەکەت چییە؟

ئێمە هەردووکمان وابەستەی دایکمانین، نامانەوێت بە تەنها بەجێیان بهێڵین، کەواتە با یان لە خانووی دایکی تۆدا، یان لە خانووی دایکی مندا پێکەوە بژین؟!

باشە ئەوە چ دەردێك چارەسەر دەکات؟

دەرمانی دەردی هەردووکمان یەك شتە، با دایکمان لە هەمان ئەو خانووەی کە خۆمانی تێدایین پێکەوە بن، ئەو کات ئەوان لە لای خۆمان دەبنو لێمان دوورناکەونەوە، بەمجۆرە کێشەی هەر دووکمان چارەسەر دەبێت!

منیش زۆر بەخۆشحاڵییەوە پێشنیارەکەی کامەرانم قبوڵ کرد، دایکمو دایکی کامەرانیش، بە پێشنیارەکە ڕازیبوون، بەڵام وتیان بەو مەرجەی ئەگەر پێکەوە ژیانمان لەگەڵ ئێوەدا نارەحەت بوو، ئەوا ئێمەش خۆمان سەربەخۆ دەژین!

بەم شێوەیە پێکهاتینو بۆ جاری دووەم لە ژێر ساباتی ماڵێکی خنجیلانەدا لەگەڵ کامەران هاوسەرگیریم کرد!

ئەمڕۆ کە چیرۆکی ژیانی خۆم بۆ ئێوەی ئازیز دەنووسمەوە، سێ ساڵ بەسەر ژیانی هاوبەشی منو کامەراندا تێپەڕیوە، سەرەڕای ئاسوودەییو بەختەوەری خۆمان، دایکی هەردووکیشمان زۆر ئاسوودەو خۆشحاڵن!

سەرچاوە: روزهای زندگی.



و. لە فارسییەوە: فەرید حەمەعەزیز

# دایکم.. ئەم کاکێشانە بێ کۆتاییەی میهر

گەر تۆ نەبوویتایە؟

گەر تۆ نەبوویتایە.. عیشق بە کەڵکی چی دەهات، ڕۆژو شەوو بەهەشت بۆ کێ دەرازێنرایەوە؟

گەر تۆ نەبوویتایە.. هیچ وشەیەك لە دایك نەدەبوو، شاعیران لێویان بە وتەیەك نەدەکردەوە.

گەر تۆ نەبوویتایە.. دڵەکان لە پاشخانێکی لە بیر کراوداو لە جێ خەوێکی کوژاوەدا ئەڕزان.

گەر تۆ نەبوویتایە.. من هەروەك ئەوەی لە کۆڵانە تاریکەکانی ئەزەلی گەمارۆ دراودا مابێتمەوەو هەنگاوم نەئەنایە سەر زەویی.

گەر تۆ نەبوویتایە.. چ کەسێك دڵتەنگیو چاوەڕوانی فێری من نەدەکرد، کام دەستە قژەکانم شانە دەکات؟

گەر تۆ نەبوویتایە.. چ کەسێك خۆزگەکانی لە سینەمدا دەناشت، ئەلف بێی خۆشویستنی دەهێنایە سەر زمانم؟

گەر تۆ نەبوویتایە.. چ کەسێك لانکەم لە نێوانی کاکێشانو مەلەکوتدا ڕادەژەنیو لە بارەی مناڵێتی هەسارەکانەوە چیرۆکم بۆ دەگێڕێتەوە؟

گەر تۆ نەبوویتایە.. چ کەسێك من ئاشنا دەکات لەگەڵ پەپوولە عاشقەکانو چۆلەکە میهرەبانەکان.

گەر چاوەکانی تۆ نەبوونایە..

گەر دەستەکانی تۆ نەبوونایە..

گەر ئاوازو لایلایەی تۆ نەبێت..

گەر زەردەخەنەی تۆ نەبێت.. تەڵ تەڵی لەشم لە یەکتری دەترازاو یەك دڵۆپ ئاورنگیش لەسەر پەڕەی گوڵەکانم هەڵنەدەنیشت..

تۆ بوویت لەگەڵ هەورەکانو پەلکە زێڕینەدا جلو بەرگێکت بۆ دووریمو خەونەکانمت لە ئامێزی گەرمی خۆتداجێ کردەوە..

تۆ بوویت کە دانە دانەی خانەکانم لەگەڵ بۆنێك تێکەڵکرد (کە لە پەڕو باڵی جوبرەئیلەوە) دەچکاو..

بۆ ئێسقانە بچکۆڵانەکانم لایلایەت کرد.

تۆ بووی کەدەستمت خستە دەستی فریشتەکانو بە ئەوانت گوت:

(تەنانەت بۆ ساتێکیش لە من جیانەبنەوە)

گەر تۆ نەبوویتایە..

گەر تۆ نەبینم...

ئەم چاوانە بە کەڵکی چی دێن..




# ئازیزترین خۆشەویست

پاش چەند ڕۆژێك میوانێكی ئازیز، خۆشەویستێكی لە دڵاشیرین، ئەویندارێكی ڕابەری عیشقو ئەڤینی ڕاستەقینە، دەبێتە میوانمان.

بۆ هاتنی ئەم میوانە ئازیزە، لانەی دڵەبچكۆلەكان دیوەخانە، سۆمای چاوگەشەكان چراخانە، هەموو دنیا، گشت كائینات، بۆ دیداری چاوەڕوانە.

بووكی بەهەشت، خەڵاتی پەروەردگاری میهرەبانم، گەر دەزانی ئێمە چەندە چاوەڕوانین، گەر دەزانی بۆ گەیشتنت چەند بە تاسەو چەند موشتاقو نیگەرانین، زوو دەهاتیو لە باوەشی میهرو ئەوینو نازتدا، ڕۆحی شەكەتو ماندووی مەت، لە چنگی دەیجوری غەفڵەت ڤوتار دەكرد..

وەرە ئازیز، با باری ڤورسی سەرشانمان، تۆزێك سووككەین، بۆ هەدەری عومرێكی زۆر بۆ حەسرەتو پەشیمانی، شینێ سازكەین..

وەرە ئازیز، با بە فرمێسكی گەرمی چاوان، پەڕبەپەڕی گوناهەكانمان بشۆرین، لە ژێر پرچی ڕەشی شەوا لە بەیانا، لە ژووانی خۆشەویستیو پەیمانگای بەرزی ئەوینا، لە سوژدەدا، لە كڕنووشی پڕ ئەنینا!

بڵندیكەین دەستی نزا بەرەو عەرشی پەروەردگار بە دڵێكی شكاوەوە، بە هەنسكو بە ئەسرینی ڕژاوەوە، وەرە ئەی دەروازەی بەخشندەیی، وەرزی میهرو خۆشەویستی، پەنجەی نەرمی بەزەییو سۆز، یاری هەژارو نەدارو لێقەوماوو كەساسەكان، ڤوتابخانەی برایەتیو خۆشەویستیو لێبوردنو مەردایەتی.

وەرەو ساتێك حەوانەوە بدە بە ڕۆحمان، لە ژێر سێبەری لوتفی تۆدا، ئارەڤی ماندوێتیو هەناسە ساردیمان بسڕە، دڵەكانمان بە تیشكی زیوینت بشۆرە، بەزەییو نەرمونیانیو دڵنیایی بگێڕەوە نێو سینگی مرۆڤەكان، ڕووخسارمان بە بارانی میهری خودایی لە تۆزی گوناهو تاوانو ستەم، پاكەرەوە.

وەرە هەی ئازیزترین خۆشەویست، منداڵە بێ باوكەكان، چاوەڕوانی هەڵاتنی هیلالی تۆن، تا جارێكی تر دەستێكی نەرم كاكۆڵیان بۆ شانەكاو بە ماچێكی گەرم سۆزێكی باوكانەیان پێببەخشێت!

هۆ نازدارەكەم، كێڵگەی هیواكانمان خەریكە هەڵەپروكێ، گەروومان وشكو تاڵە، وەرە بە پەرداخێك ئاوی بەربانگ، كێڵگەی هیواكانمان تێراوكە، بە دەنكە خورمایەك گەروومان شیرینكەو شیرینی ببەخشە بە ناخمان، وەرەو شەوقێ بدە بە چرا كزەكانمان!

ڕۆشنكەرەوە دیوەخانی زیكرو فیكرو تەراویحو ڤیامی شەومان.

وەرە مانگی سەركەوتنو پێشكەوتنو دەركەوتنو هەڵكەوتن، مانگی تواناو هێزو نەسرەوتن.

وەرە ڕوحەكەم، با لە بەدرێكی تردا نەفس و شەیتانو نەفامی ئەم سەردەمە، بخەینە ژێر غیرەتو غیرەتی بەندایەتی بۆ خوداو چیتر ئەسیرو بەندی دەستی ئیبلیس و ئیبلیس زادەكان نەبین!

وەرە پەردەی ڕەشی تاریكی سەرچاوەكان، بڕەوێنەوەو سۆمای چاوەكانمان پڕكە لە نوور، هۆ مانگی ڤورئانو هیدایەتو نورو مەرهەمی دڵانی بیمارو بریندار.

توخوا زوو وەرە ئێمەی بەندەی كلۆڵ، دەستەو نەزەر چاوەڕوانی فەڕوخێرو بەرەكەتی تۆین، (ڕەمەزان).

شێخانی